منصور عبدالحكیم

# خانەوادەو ڕێکخراوە مەترسیدارەکانی جیهان

ئەو خانەوادەو ڕێکخراوانەی بەنهێنی فەرمانڕەوایەتی جیهان دەکەن

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com



وەرگێڕانی: چیا هادی

2020

منتدى إقرأ الثقافي

منصور عبدالحكيم

# خانەوادەو ڕێکخراوە مەترسیدارەکانی جیهان

## ئەو خانەوادەو ڕێکخراوانەی
## بەنهێنی فەرمانڕەوایەتی جیهان دەکەن

وەرگێڕانی: جبا هادی

٢٠٢٠

منتدى إقرأ الثقافي



ناوی کتێب: **خانەوادەو ڕێکخراوە مەترسیدارەکانی جیهان**

**ئەو خانەوادە و ڕێکخراوانەی بەنهێنی فەرمانڕەوایەتی جیهان دەکەن**

ناوی نووسەر: منصور **عبدالحکیم**

ناوی وەرگێڕ: **چیا هادی أحمد**

دیزاینی ناوەوەو بەرگ: **شێرکۆ خانزادی**

تایپ و پیت چنین: **توانا هادی، ژیار چیا**

چاپ: **یەکەم ٢٠٢٠**

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٥٣٥)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە

© مافی لەچاپدانەوەی ئەم بەرهەمە پارێزراوە بۆ وەرگێڕ



**چاپ: کتێبخانەی گەشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

**سلێمانی: بازاڕی ئاوباریک. بەرامبەر کاسۆ مۆڵ. دوکانی ٧١**

**٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣ - ٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦**

منتدى إقرأ الثقافي



لــەو کاتەوەی خــودای میهرەبان ژیانی لەســەر زەوی دروســت کــردووە ، ململانــێ و کێشــمەکێش لەنێــوان مرۆڤەکاندا دروســت بووە ، بــە بەردەوامی تاقمێــك و دەســتەیەك لــە مرۆڤــەکان (هۆزێــك یــان بنەماڵەیــەك ، یان هەڵگــران و پەیڕەوانــی ئایینێك) ویســتوویانە دەســت بگرن بەســەر زەوی و خــاك و ناوچــەی ئەوانی تــردا و خێر و بێر و ســامانی ژێر زەوی و ســەر زەوی بــۆ خۆیان ببــەن، زۆرجار مرۆڤەکانی ئــەو ناوچانەیــان کۆیلە کردووە و چەوســاندووەتەوە؟!

زۆر جار پاڵنەری ســەرەکی لە پشــت ئــەم کارانەوە پاوانخــوازی یان ئایینی بووە؟

(بێگومان بەهەڵە تێگەیشــتن لە دەقە پیرۆزەکان) بــۆ نموونە جوولەکەکان دەڵێــن: ئێمە گەلی هەڵبــژاردەی خوداین بۆیە ڕەوایەتــی دەدەن بەو کارانەی کــە خۆیان بەباشــی دەزانن ئەگەر لەســەر بەرژەوەنــدی نەتەوەکانی تر بێت. یاخــود پەیڕەوانی ئایینی مەســیحی و بەتایبەت بنەچــەی (میرۆفینجینیین) کە پێیان دەڵێن بنەچەی (مەســیح عیســای کــوڕی مەریەم) ســەلامی خوایان لەســەربێت ، ئەورووپییــەکان پێیان دەڵێــن بنەچەی(پاشــازادەکان) و دەچنەوە ســەر (عیســای کوڕی مەریەم)؟! بە درێژایــی مێژوو ئەم بنەچەیــە وتوویانە ئێمە (بنەچــە پیرۆزیین) خوێنی پیرۆز لــە دەمارەکانماندا دەســوڕێت؟؟ بۆیە دەبێت پاشــا و فەرمانــڕەواکان لە ئێمە بێــت؟! بێگومان ئــەم بیرکردنەوە و تێگەیشــتنانە جۆرێك لە ســتەمکاری دروســت دەکات ، مافــی نەتەوەکانی تر پێشــێل دەکات ، لێــرەوەد کارەکان بە ئاراســتەی بەهێزەکان و باڵادەســتەکان جێگیــر دەبێــت و دابەشــکاری و پلەبەندی لە نێــوان وڵاتانــدا ڕوودەدات ، وڵاتانــی پلە یەك خاوەن دەســەڵات و هێز و پێشــکەوتنن ، وڵاتانی پلە دوو ، وڵاتانی پلە ســێ لەخوار ئەوانــەوەن...؟؟!!

ئــەم کتێبــە زۆر بە ووردی تیشــکی خســتۆتە ســەر چەنــد بنەماڵە و خانەوادەیەك کە زۆر زیرەکانە دەســتیان بەســەر دارایی و بانکەکان و بازرگانی و تەنانــەت کاری سیاســی و رامیــاری دا گرتووە؟؟ هاوکات ئامانجی ســەرەکی

لە پشت کارەکانی زۆربەی ڕێکخراوە جیهانییەکانەوە ئاشکرا کردووە .

نوورانیەکان و ماسۆنیەکان ئەو دوو ڕێخراوە نهێنییە مەترسیدارەن جیهان لە پشتی پەردەوە بەڕێوەدەبەن لە ڕێگەی دام و دەزگا جۆراوجۆرەکان و سامان و داراییە لەبن نەهاتوەکەیانەوە ، ئەوان لە پشت زۆربەی ڕووداو و جەنگ و کودەتا سەربازییەکان و دارمانی بۆرسەو بانکەکان وداڕوخانە ئابوورییەکان و داڕێژەری پلانی کەمکردنەوەی ژمارەی دانیشتوانی گۆی زەوین بۆ ٥٠٠ ملیۆن کەس؟؟!

دەکرا تێکڕای مرۆڤەکان ئەو ویستە خودایی یە جێبەجێ بکەن کە لە سورەتی حوجورات دا دەفەرموێ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا * إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ * إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (الحجرات _الآية١٣). واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە(باوکە ئادەم و دایکە حەوا) کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆر بە جۆر تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆشبێت بەیەکەوە.. بەراستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خواترسە و فەرمانبەرداری خوایە ، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەمووان.

- تێکەڵاوی کردنی یەکتری و گۆڕینەوەی زانست و زانیاری و کەلتوور و هاوکاریکردن و تەواوکردنی کارەکانی یەکتری ئەو مەبەستە خوداییە یە کە مرۆڤایەتی بۆ دروست بووە؟

لە کۆتاییدا لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا بۆ سەر زمانی کوردی ئەوەندەی مەبەستم گەیاندنی هەندێ زانیاری بووە بە تۆی خوێنەر مەبەستم دروست بوونی جۆرێك لە ڕەشبینی و نائومێدی نەبووە ، چونکە مرۆڤی گەورە و نەتەوەی گەورە لە نائومێدی نومێد و لە شکست هەستانەوە دروست دەکات.

چیا هادی

٢٠٢٠/١/٣٠ چەمچەماڵ

# سەرەتاو دروستبوونی مرۆڤ

- ئادەم باوکی مرۆڤایەتی ئەسڵ و سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ
- قۆناغەکانی دروست بوون و ئەو مادەیەی لێی دروستکراوە



منتدى إقرأ الثقافي

# ئادەم باوکی مرۆڤایەتی و سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ

ئادەم (سـەلامی خـوای لێبێت) خـوای گەورە لە خـۆڵ دروسـتی کردووە، بۆیە پێـی وتراوە (ئـادەم) چونکە لە (أديـم الأرض)[1] واتە لە خۆڵـی رووی زەوی دروسـتکراوە، هەروەها (حەواء) لە یەکێک لە پەراسـووەکانی ئادەم دروسـتکراوە، نـاوی حەواء بـە واتای لە لەشـێکی زینـدووەوە کە (ئـادەم)ە دروسـتکراوە، دواتریـش وەچـەی مرۆڤایەتی لەوانەوە دروسـت بووە.

خـوای گـەورە دەفەرموێت (**يَـا أَيُّهَا النَّـاسُ اتَّقُوا رَبَّكُـمُ الَّـذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْـسٍ وَاحِـدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَـا زَوْجَهَا وَبَـثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِـيرًا وَنِسَـاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَـاءَلُونَ بِـهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّـهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا.(النسـاء_ الآية١).**

واتـە (ئەی خەڵکینە لە خەشـم و نارەزایەتی ئـەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسـێک دروسـت کردووە، هەر لەو نەفسـەش هاوسەرەکەی بەدیهێناو لـەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خسـتۆتەوەو بڵاوکـردەوە، هەروەها لـەو خوایە بترسـن کـە لەیەکـتر داوا دەکـەن بـە ناوهێنانی ئـەوەوە، هەوڵ بـدەن پەیوەندی خزمایەتیـش بپارێزن و (پتـەوی بکەن) چونکە بەڕاسـتی خوا (هەمیشـەو بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە(تەفسـیری ئاسـان - لاپەرە٧٧).

هیـچ جیاوازیەک نیە لە نێـوان خـاوەن کتێبەکانی پێشـوو (جولەکەو گاور) ەکان و مسـوڵمانەکان سـەبارەت بـەوەی کە ئەسـڵی دروسـتبوونی مرۆڤ لە (ئـادەم و حەواء)ەوەبە (سـەلامی خوایـان لێبێت).

خـوای گەورە لـە قورئانـدا دەفەرموێت (ئادەم)م لە ئاسـمان دروسـتم کرد وە خسـتمە ناو بەهەشـتەوە (جیاوازی هەیە کە ئایا ئەو بەهەشـتە بەهەشـتی نەبڕاوەیە؟ یان بەهەشـتێک بووە لەسـەر زەوی) خودای گەورە دەفەرموێت: **وَإِذْ**

[1] (١) لە فەرهەنگی (معجم الوسيط)دا (أديم الأرض) ئەو خۆڵە نەرمەی رووی زەوی

- لە فەرهەنگی (معجم الوسيط)دا (الطين) ئەو خۆڵەی کە ئاوی تێکەڵکراوە. واتە (قوڕ)
- لە (لسان العرب): (الطين اللازب)/ ئەو قوڕە شلەی کە دەنوسێتە دەستەوە.
- (لسان العرب)/ الصلصال/ قوڕی ووشکەوە بوو.

**قَـــالَ رَبُّـــكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِــلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِـــدُ فِيهَا وَيَسْـــفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَـــبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَـــدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَـــا لَا تَعْلَمُونَ. (البقرة _ الآية ٣٠).**

واتـــە (ئەی محمد(دروودی خودای لەســـەربێت) باســـی ئەوە بکـــە لە دێرین زەماندا پەروەردگارت بە فریشـــتەکانی وت: بە ڕاســـتی مـــن دەمەوێت لە زەویدا جێنشـــینێک دابنێم (بـــو ئاوەدانی و دینداری)، فریشـــتەکان وتیان: ئایا کەســـێکی تیـــادا دەکەیتە جێنشـــین کە خراپـــەو تاوانی تیـــادا بچێنێت و خوێنڕێـــژی تیادا ئەنجـــام بدات؟! لە کاتێکدا ئێمە تەســـبیحات و ســـوپاس و ستایشـــت دەکەین و قـــەدرو ڕێزی تۆ چـــاک دەزانین و بەدوورت دەگرین لەو شـــتانەی شایســـتەی تۆ نین، (لـــە وەڵامیاندا) خودافەرمـــووی: بێگومان ئەوەی ئێوە نایزانـــن من دەیزانم. (تەفسیری ئاســـان- لاپەڕە٦).

پاشـــان خـــوای میهرەبان لـــە قورئاندا بـــاس لە ســـەرەتای دروســـت بوونی ململانێی نێـــوان ئادەم و شـــەیتان دەکات دەفەرموێت. **(وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْـــكُنْ أَنتَ وَزَوْجُـــكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَـــا رَغَدًا حَيْثُ شِـــئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّـــجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِـــينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا الشَّـــيْطَانُ عَنْهَـــا فَأَخْرَجَهُمَا مِـــمَّا كَانَا فِيـــهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُـــمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْـــتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِـــينٍ. (٣٦) فَتَلَقَّىٰ آدَمُ مِنْ رَّبِّهِ كَلِـــمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّـــهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيـــمُ (٣٧) قُلْنَا اهْبِطُـــوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّـــا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُـــدًى فَمَن تَبِعَ هُـــدَايَ فَلَا خَـــوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُـــمْ يَحْزَنُونَ (٣٨)، (البقرة).**

واتـــە: (کاتێکیش بە فریشـــتەکانمان ووت: ســـوژدە بەرن بۆ ئادەم (ســـوژدەی ڕێـــز و بە فەرمانی خـــوا، وەکو ڕووگەیەک) ســـوژدەیان برد، جگـــە إبلیس نەبێت کە ســـەرپێچی کـــرد و خۆی بە گـــەورە زانی و خۆی خســـتە ریـــزی کافرەکانەوە، ئینجا وتمـــان: ئەی ئادەم خۆت و هاوســـەرت لەم بەهەشـــتەدا ژیان بەرنە ســـەر و نیشـــتەجێ بن لە هەر کـــوێ حەزدەکەن بخـــۆن و بخۆنەوە بە تێرو تەســـەلی، بەڵام نزیکی ئەو درەختـــە مەکەون (درەختێکی دیاریکراو بـــۆ تاقی کردنەوە لێیان

قەدەغــە کرا) ئەگینا دەچنە ریزی ســتەمکارانەوە، شــەیتان (فرســەتی لێهێنان) و لە خشــتەی بردن (وای لێکردن لــە بەروبوومی درەختە قەدەغــە کراوەکە بخۆن) و لەو شــوێنە (خۆش و پڕ لــە نازو نیعمەتە) بــە دەر کردنی دان، ئەوســا پێمان وتــن: (مادەم ســەرپێچیتان کــرد ئیتر لێــرە جێتان نابێتــەوە )،دەبێــت دابەزنە خوارەوە بۆ ســەر زەوی، جا (لــەوێ) هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن (شــەیتان دوژمنــی ئێوەیە و بەردەوام هەوڵــدەدات دوژمنایەتی لە نێوانتانــدا بەرپا بکات)، تــا ماوەیەکی دیاریکراو نیشــتەجێ دەبن لــە زەویداو لە نازو نیعمەتەکان ســود وەردەگــرن و بەهرەوەر دەبن، پاشــان ئادەم لــە لایــەن پەروەردگاریەوە چەند وشــەو نزایەکی وەرگرت (بە دڵ و بە کــوڵ پاڕایەوە خــوای میهرەبانیش) نزاکەی وەرگرت و لێیخــۆش بوو، چونکە بە ڕاســتی تەنها ئەو، زاتێکی ئێجــگار میهرەبان و تۆبــە وەرگــرە، ئینجا وتمــان: هەمووتان دەبێــت دابەزن بۆ (ســەر زەوی) جا ئەگــەر هەر کاتێک لــە لایەن منەوە ڕێنموویتان بۆهات، هەر کەســێک شــوێن ڕێنومایــی من بکەوێت، ئــەوا نە ترس و بیمیان لەســەر دەبێت، نــە غەمگین و دڵتەنگ دەبن).(تەفســیری ئاســان - لاپەڕە٦_ ٧).[٢]

- پاشــان قۆناغــی کۆتایی و روحکــردن بە بەریــدا و دروســت بوونی ئادەم (ســەلامی خوای لێبێت).

هۆکاری باســکردنمان بــۆ دروســتبوونی (ئادەم) بــۆ ئــەوە دەگەڕێتەوە کە هەندێــک هەن پێیــان وایە کە (گــەورەکان و خانــەوادەکان) لە نــەوەی ئادەم نیــن؟؟ بۆیە خۆیــان بە پیــرۆز دەزانن!..

٢ الحمأ المسنون/ الحماء/ قوڕێک کە بمێنێتەوەو ڕەنگی بەلای ڕەشدا بچێت.

زۆربەی ڕاڤەکاران و زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئادەم پێش ئەوەی رووح بکرێت بە بەریدا بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:-

١- المرحلة الطينة/ (وبدأ خلق الأنسان من طين) واتە مرۆڤمان لە قوڕ دروستکردووە.

٢- المرحلة الحمئية/ قۆناغی قوڕێکی ڕەنگ گۆڕاو، یان قوڕێک کە بۆنێ لێوەبێت.

٣- المرحلة الصلصالية/ قۆناغی سێیەم کۆتایی قوڕێکی ووشکەوە بوو سورەوەکراو کە دەستی بەر کەوێت دەنگێک دەردەکات.

پاشـــان خوای گەورە بە فریشـــتەکانی ڕاگەیاند کە: **وَإِذْ قَالَ رَبُّــكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِــلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَـــةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِـــدُ فِيهَا وَيَسْـــفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَـــبِّحُ بِحَمْـــدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَـــالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَـــا لَا تَعْلَمُونَ. (البقـــرة _ الآية ٣٠).** واتە: (ئـــەی محمـــد (دروودی خوای لەســـەربێت) باســـی ئەوە بکە لـــە دێرین زەماندا) پەروەردگارت بە فریشـــتەکانی وت: بە ڕاســـتی مـــن دەمەوێت لە زەویدا جێنشـــینێک دابنێم بۆ (ئاوەدانـــی و دینداری)، فریشـــتەکان وتیان ئایا کەســـێك تێـــدا دەکەیتە جێنشـــین کە خراپـــە و تاوانی تیـــادا بچێنێت و خوێنڕێـــژی تیادا ئەنجام بـــدات؟! لەکاتێکدا ئێمە تەســـبیحات و ســـوپاس و ستایشـــت دەکەین و قـــەرد و ڕێزی تۆ چـــاك دەزانین و بەدوورت دەگرین لەو شـــتانەی شایســـتەی تۆ نین لـــە وەڵامدا خـــودا فەرمـــووی: بێگومان ئەوەی ئێـــوە نایزانن مـــن دەیزانم. (تەفسیری ئاســـان- لاپەڕە٦).

فریشـــتەکان زانیان کـــە خوای گـــەورە دەیەوێت ئادەم و نەوەکانی دروســـت بکات کـــە نەوە لە دوای نـــەوە جێگەی یەکـــتر دەگرنـــەوە. **(هُوَ الَّـــذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِـــفَ فِي الْأَرْضِ فَمَـــن كَفَـــرَ فَعَلَيْـــهِ كُفْرُهُ (فاطـــر _الآية ٣٩).** واتـــە: هەر ئەو زاتـــە ئێوەی کردە جێنشـــین لە زەویدا (تەفســـیری ئاســـان _ لاپـــەڕە٤٣٩). خوای میهرەبـــان ئـــاگاداری کردنەوە کە ئـــادەم و وەچەکانی دروســـت دەکـــەم، وەکو هەواڵێکـــی گەورەی پـــێ ڕاگەیاندن پێش ئەوەی دروســـتی بکات فریشـــتەکان بۆ ڕوونکردنـــەوەو زانیاری زیاتر دەســـتیان کرد بە پرســـیار کردن لە خـــوای گەورەو میهرەبان ســـەبارەت بەم دروســـتکراوە نوێیـــە، نەک بە کەم زانیـــن و ڕەخنە گرتن و ئیرەیـــی بردن بە ئـــادەم بۆیە وتیان **(قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِـــدُ فِيهَا وَيَسْـــفِكُ الدِّمَـــاءَ) البقـــرة_ الآيـــة٣٠)** واتە: وتیـــان ئایا کەســـێك تیادا دەکەیتە جێنشـــین کە خراپـــە و تاوانی تیـــادا بچێنێت و خوێنڕێـــژی تیادا ئەنجام بدات (تەفســـیری ئاســـان_ لاپەڕە٦). ئەم وەڵام دانەوەیەی فریشـــتەکانیش لەســـەر ئەم بنەمایە بوو کـــەوا پێش ئـــادەم بە دوو هەزار ســـاڵ هۆزی (جـــن و بون) لەســـەر زەوی بوون و خوێنڕێژیەکـــی زۆریان کرد، پاشـــان خوای گەورە ســـەربازانی فریشـــتەی ناردە

ســـەریان و لەناویان بـــردن و ڕاویان نـــان بۆ دورگەکانی نـــاو دەریاکان.

وەک لـــە فەرموودەیەکی راســـتی پێشـــەوا موســـلیمدا هاتووە دروســـتکردنی ئادەم (ســـەلامی خوای لێبێت) لە کۆتـــا کاتژمێرەکانی رۆژی هەینیـــدا بووە . **خير يوم طلعت في الشـــمس يوم الجمعة: فيـــه خلق آدم و أدخل الجنـــة و فيه أخرج منهـــا**، واتە: باشـــترین رۆژێک کە خۆری تیـــا هەڵبێت رۆژی هەینیـــە تیایدا ئادەم دروســـتکراو کرایە بەهەشـــتەوەو هەر لە رۆژی هەینیشـــدا لە بەهەشتدا دەرکرا. خـــوای میهرەبـــان (جبریل) دەنێرێتە ســـەر زەوی بـــۆ ئەوەی خۆڵی بـــۆ بێنێت و ئادەمی پێ دروســـت بـــکات، بـــەڵام زەوی وەڵامی جوبرەئیل دەداتـــەوەو دەڵێت پەنـــات پێدەگـــرم بە خوای گـــەورە کە لێـــم کەم بکەیتـــەوەو بە کەم تەماشـــام بکەیـــت، جوبریلیش دەگەڕێتـــەوەو دەڵێت خوایـــە گیان خۆی پاراســـت بە تۆو منیـــش گەڕامەوە. پاشـــان خوای گـــەورە (میکائیل) دەنێرێت ئەویـــش بە هەمان شـــێوە بە دەســـتی خاڵی دەگەڕێتەوە. دواتر خوای گەورە فریشـــتەی گیان کێشان (ملك المـــوت) دەنێرێتە ســـەر زەوی و بە هەمان شـــێوە دەڵێت پەنـــا دەگرم بە خـــوا کە خۆڵـــم لێ نەبەیـــت، ئەویش دەڵێت پەنـــا دەگرم بە خـــوا ئەگەر خۆڵت لێ نەبـــەم و بگەڕێمەوەو فەرمانەکـــەی جێبەجێ نەکەم، بۆیە لـــە توێژاڵی زەوی و لە خۆڵی هەمەڕەنگ واتە ســـپی و ســـور و ڕەش دەبات و هەر لێرەشـــەوەیە کە ڕەنگی مرۆڤەکان جیاوازن، پاشـــان کـــە خۆڵەکە بەرەو ئاســـمان دەبات و خۆڵەکە تەڕ دەبێت و دەبێتـــە قوڕێکی (لازب)[٣].

خـــوای میهرەبـــان بە دەســـتی پیرۆزی خـــۆی دروســـتی کرد، بۆ مـــاوی چل ســـاڵ بە شـــێوەی قـــوڕ مایـــەوە فریشـــتەکان کاتێک بـــە لایـــدا تێدەپەڕین بە تایبەتـــی (شـــەیتان) (إبليس) هەر کاتێک بـــە لایدا تێدەپەڕی دەســـتێکی لێدەداو زرینگەیەکـــی لێوەدەهات (**خَلَقَ الْإِنسَـــانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ (ســـورة الرحمان ـ الآية١٤)**. واتـــە: ئادەمیزادی دروســـتکردووە لە قوڕێکی وشکەوەبوو.(تەفســـیری ئاســـان ـ لاپەرە٥٣١).

---

٣ (١) لازب / قوڕێکی خۆگرتوو جێگر تەماشای (البداية و النهاية)ی (ابن كثير) بكە.


منتدى إقرأ الثقافي

کە شـــتێکی بەر دەکەوێت زرینگەیەکـــی لێوە دێت، هەمـــوو کاتێک دەیوت تۆ بـــۆ کارێکی گەورە دروســـت کراویت، بۆیە لـــە دەمیەوە دەچـــووە ژوورەوەو لـــە دواوەی دەردەچوو، وە بەفریشـــتەکانی تری دەوت مەترســـن لێـــی ناوەکەی بۆشـــە. تا کاتی ئەوە هـــات خوای میهرەبـــان روحی کرد بـــە بەریدا.

خـــوای میهرەبان فەرمانی کرد بە ســـەرجەم فریشـــتەکان کڕنووشـــی ڕێز ببەن بۆ (ئادەم) (ســـەلامی خوای لێبێـــت) دەفەرموێت **(وَإِذْ قَـــالَ رَبُّـــكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِـــلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَـــةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِـــدُ فِيهَا وَيَسْـــفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَـــبِّحُ بِحَمْـــدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَـــمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٣٠) وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْـــمَاءَ كُلَّهَـــا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَـــلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَـــالَ أَنبِئُونِي بِأَسْـــمَاءِ هَٰؤُلَاءِ إِن كُنتُـــمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُـــوا سُـــبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَـــا عَلَّمْتَنَا إِنَّـــكَ أَنتَ الْعَلِيـــمُ الْحَكِيمُ (٣٢) قَـــالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْـــمَائِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُم بِأَسْـــمَائِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُـــل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْـــبَ السَّـــمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَـــا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُـــمْ تَكْتُمُـــونَ (٣٣) وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْـــجُدُوا لِآدَمَ فَسَـــجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْـــتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (٣٤) وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْـــكُنْ أَنـــتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّـــةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِـــئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّـــجَرَةَ فَتَكُونَا مِـــنَ الظَّالِمِينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا الشَّـــيْطَانُ عَنْهَـــا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيـــهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُـــمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُـــمْ فِي الْأَرْضِ مُسْـــتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِـــينٍ (٣٦) فَتَلَقَّـــىٰ آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَـــابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّـــوَّابُ الرَّحِيمُ (٣٧) قُلْنَـــا اهْبِطُوا مِنْهَـــا جَمِيعًا فَإِمَّـــا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُـــدًى فَمَن تَبِعَ هُـــدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِـــمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُـــونَ (٣٨) وَالَّذِينَ كَفَـــرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِـــكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُـــمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٣٩) (ســـورة البقرة).**

واتە (ئـــەی محمد (درودی خوای لەســـەربێت) باســـی ئەوە بکـــە لە دێرین زەماندا پەروەردگارت بە فریشـــتەکانی وت: بە ڕاســـتی مـــن دەمەوێت لە زەویدا جێنشـــینێک دابنێم (بـــۆ ئاوەدانی و دینداری)، فریشـــتەکان وتیان: ئایا کەســـێکی تیـــادا دەکەیتە جێنشـــین کە خراپـــەو تاوانی تیـــادا بچێنێت و خوێنڕێـــژی تیادا ئەنجـــام بدات؟! لە کاتێکدا ئێمە تەســـبیحات و ســـوپاس و ستایشـــت دەکەین و

قـــەدرو ڕێزی تۆ چـــاک دەزانین و بە دوورت دەگرین لەو شـــتانەی شایســـتەی تۆ نیـــن، (لە وەڵامیاندا) خـــوا فەرمووی: بێگومـــان ئەوەی ئێوە نایزانـــن من دەیزانم . (ئینجا ئادەمی دروســـتکرد، ویســـتی توانایـــی و لێهاتووی بۆ فریشـــتەکان روون بکاتـــەوە) ناوی هەرچـــی پێویســـتی دەوروبەر هەیـــە فێری کرد، لـــەوەودوا بە فریشـــتەکانی ڕانوانـــدو پێی فەرمـــوون: ئادەی ئێـــوە ناوی ئەو شـــتانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاســـت دەکەن و (توانای ئاوەدان کردنەوەی زەویتان هەیە؟). فریشـــتەکان وتیان: پاکی و بێ گەردی و ســـتایش هەر شایســـتەی تۆیە ئێمە هیچ زانســـتێکمان نیـــە، تەنها ئەوە دەزانیـــن کە تۆ فێرت کردووین، بە ڕاســـتی تـــۆ پەروەردگارێکی زانـــاو دانایت. ئەوســـا خوا فەرمـــووی ئەی ئادەم، ئـــادەی تۆ ئاگاداریـــان بکە بە ناوەکانیان.

جـــا کاتێک ئادەم هەواڵـــی ناوەکانی پێـــدان: خوا فەرمووی: ئـــەی پێم نەوتن بە ڕاســـتی خـــۆم ئـــاگادارم بە نهێنـــی ئاســـمانەکان و زەوی دەشـــزانم ئێوە چی دەردەخەن و چی دەشـــارنەوە؟! . کاتێکیش بە فریشـــتەکانمان وت: ســـوژدە بەرن بۆ ئادەم(ســـوژدەی رێز و بـــە فەرمانی خوا، وەکـــو ڕووگەیەک) ســـوژدەیان برد، جگـــە ئیبلیس نەبێت کە ســـەرپێچی کردو خـــۆی بە گەورە زانی و خۆی خســـتە ریـــزی کافرەکانەوە. ئینجا وتمان: ئەی ئادەم خۆت و هاوســـەرت لەم بەهەشـــتەدا ژیان بەرنەســـەر و نیشـــتەجێ بن لە هـــەر کوێ حەزدەکەن بخـــۆن و بخۆنەوە بە تێرو تەســـەلی، بـــەڵام نزیکی ئـــەم درەختە مەکـــەون (درەختێکـــی دیاریکراو بۆ تاقـــی کردنەوە لێیـــان قەدەغەکرا) ئەگینا دەچنە ریزی ســـتەمکارانەوە. شـــەیتان (فرســـەتی لێهێنان) و لە خشـــتەی بـــردن (وای لێکـــردن لە بەروبومـــی درەختە قەدەغـــە کراوەکـــە بخۆن) و لەو شـــوێنە (خـــۆش و پڕ لـــە نـــازو نیعمەتە) بە دەرکردنـــی دان، ئەوســـا پێمان وتـــن: (مادەم ســـەرپێچیتان کرد ئیـــتر لێرە جێتان نابێتـــەوە)، دەبێـــت دابەزنە خـــوارەوە بۆ ســـەر زەوی، جا (لـــەوێ) هەندێکتان دوژمنـــی هەندێکتانـــن (شـــەیتان دوژمنـــی ئێوەیەو بـــەردەوام هـــەوڵ دەدات دوژمنایەتـــی لە نێوانتاندا بەرپا بـــکات)، تا ماوەیەکی دیاریکراو نیشـــتەجێ دەبن

لــە زەویداو لە نــازو نیعمەتەکان ســود وەردەگــرن و بەهرەوەر دەبن. پاشــان ئــادەم لە لایــەن پەروەردگاریــەوە چەند وشــەو نزایەکی وەرگرت (بــە دڵ و بە کــوڵ پاڕایەوە خــوای میهرەبانیــش) نزاکەی وەرگــرت و لێیخۆش بــوو، چونکە بە ڕاســتی تەنها ئــەو، زاتێکی تێجــگار میهرەبــان و تۆبە وەرگــرە، ئینجا وتمان: هەمووتــان دەبێــت دابەزن (بۆ ســەر زەوی) جــا ئەگەر هەر کاتێــک لە لایەن منــەوە ڕێنمووبتــان بۆ هات، هــەر کەس شــوێن ڕێنومایی مــن بکەوێت، ئەوە نە تــرس و بیمیان لەســەر دەبێت، نە غەمگیــن و دڵتەنگ دەبــن. ئەوانەش بێ باوەڕ بــوون و باوەڕیان بە ئایەتەکانــی ئێمە نەبوو، ئەوانە نیشــتەجێی دۆزەخن و بــۆ هەتاهەتایی تێیدا دەمێننەوە.(تەفســیری ئاســان_ لاپەڕە٦-٧)

بــۆ ماوەیەکی زۆر بــە فەرمانی خوای گــەورە (ئادەم و حەوا) لە بەهەشــدا دەمێننــەوە تــا ئــەو کاتەی کە لــەو درەختــە دەخۆن کــە خوای گــەورە لێی قەدەغــە کردبوون لێــرەوە کە ئەم ســەرپێچییە دەکــەن جل و بەرگیــان لەبەر نامێنێ و هەســت بە شــەرمەزاری دەکەن خوای گــەورەش دەفەرموێت: **(فَدَلَّاهُمَا بِغُــرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّــجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَــوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَــانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّــةِ وَنَادَاهُــمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُــمَا عَن تِلْكُمَا الشَّــجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّــيْطَانَ لَكُــمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ (٢٢) قَــالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَــنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَــا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِيــنَ (٢٣) الأعراف.**

واتە: (ئیتر شــەیتان بە فێڵ و پلان فریودان (بــەرەو لای درەختەکەی بردن) جا کاتێک تامــی بەروبومی درەختەکەیان چەشــت، هەرچی عەیــب و عاریان هەیە کەوتــە دەرەوە، (ناچار بــە پەلە) دەســتیان دایە گەڵای درەختەکانی بەهەشــت عەیب و عــاری خۆیان پێدائەپۆشــی پەروەردگاریــان بانگی کــردن و فەرمووی: ئایــا من قەدەغەی ئــەو درەختەم لێنەکردن و پێم نەوتن، کە بەڕاســتی شــەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشــکرایە؟! (ئەوســا ئیــتر هەردووکیان هەســتیان بە هەڵەی خۆیــان کــرد) و وتیان: پــەروەردگارا ئێمە ســتەممان لە خۆمان کــرد، خۆ ئەگەر لێمان خــۆش نەبیت و بەزەییت پیاماندا نەیەتەوە، ئەوە بە ڕاســتی ئێمە ســوێند

به خوا له خەســارەتمەند و زەرەرمەندانین) (تەفسیری ئاســان _ لاپەرە١٥٢-١٥٣).

دواتر خوای گەورە ئادەم و حەواء و شــەیتانی نارده ســەر زەوی له کتێبەکانی ژیاننامەکانــدا وا هاتــووە کە کاتێــک ئادەم لە بەهەشــت دەرکرا هەســتی بە پەشــیمانی دەکــردو زۆر جاریش دەگریا یاخود دەڵێن شەســت ســاڵ گریاوە، وە هەروەها لەســەر ئەو هەڵەیەش کە کردیان بە هەمان شــێوە، وە بۆ لەدەســدانی هابیل چل ســاڵ گریاوە.

کاتێک ئــادەم هاتە ســەر زەوی حەوا و مارەکــە و شەیتانیشــی لەگەڵدابوو، شــەیتان لە ناوچەی (دســتمان) کــە چەنــد کیلۆمەترێک لە بــەسرە دووره هاتە خــوارەوە، مارەکــەش لە (ئەســفەهان) هاتــە خــوارەوەو، ئــادەم حەوایش لە ناوچەیــەک کــە پێــی دەوترێت (دحنا) کــە دەکەوێتــە نێوان شــاری مەککە و تائیف هاتنــە خوارەوە.

ئــادەم و حەواء ئــەو ماوەیەی کــە لەبەهەشــتدا پێکەوە بــوون کاری ژن و مێردایەتیــان (جووتبــوون) نە کردبوو، تەنانــەت دوای هاتنە ســەر زەویش هەر یەکەیــان بــە جیــا دەخەوتن تــا جبریل فەرمانــی پێکرد کــە لەگــەڵ خێزانیدا بخەوێــت و وەچە بخەنــەوە خوای گــەورە دەفەرموێت (**قَــدِ افْتَرَيْنَا عَــلَى اللَّهِ كَذِبًــا إِنْ عُدْنَا فِي مِلَّتِكُــم بَعْدَ إِذْ نَجَّانَا اللَّــهُ مِنْهَا وَمَا يَكُونُ لَنَــا أَن نَّعُودَ فِيهَا إِلَّا أَن يَشَــاءَ اللَّهُ رَبُّنَا وَسِــعَ رَبُّنَــا كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا عَلَى اللَّــهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَــا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَــا بِالْحَقِّ وَأَنتَ خَــيْرُ الْفَاتِحِينَ.(الأعــراف _الآية ٨٩.)**

واتە: (بە ڕاســتی ئێمــە درۆمان بە ناوی خواوە هەڵبەســتووە، ئەگەر پەشــیمان ببینــەوەو بگەڕێینــەوە نــاو ئاینەکەی ئێــوە، دوای ئــەوەی خوا لە دەســت (ئەو خورافاتــە) ڕزگاری کردیــن، ئێمە بۆمان نیــە بگەڕێینەوە بۆ ناو ئاینــی ئێوە مەگەر ویســتی خوای پەروەردگارمانی لەسەر بێت، زانســت و زانیاری پەروەردگارمان فراوانە و هەموو شــتێکی گرتۆتەوە، هەر بە خوا پشــت و پەنامان بەســتوە، پــەروەردگارا خــۆت داوەری بکــە لەســەر بنچینەی حەق و ڕاســتی لــە نێوان ئێمــەو قەوم و گەلمانــدا، چونکە تۆ چاک ترینی دادوەرانی).(تەفســیری ئاســان- لاپــەرە ١٦٢) .

دایکە حواء بە هەر سـکێک دوانەیەکـی دەبوو کوڕو کچێک واتە ئەمسـاڵ کە کـوڕو کچێکی دەبوو، سـاڵێکی تر کوڕو کچێـک دواتر کچی سـاڵی یەکەمی مارە دەکـرد لە کـوڕی سـاڵی دووەم وە بە هەمان شـێوە. واتە ئـەو دووانەیەی کە بە سـکێک دەیان بوو مارەیان نەدەکـرد لە یەکتری ئەمانە دەبوون بە خوشـک و برای یەکتر، بەڵکو لەگەڵ سـکی سـاڵی دواتر کە دەیانبوو هاوسـەرگیریان پێدەکردن.

پێـش ئەوەی ئادەم بمرێت بانگی (شـیث) کوڕی کردوو ئاشـنای کاتژمێرەکانی شـەوو ڕۆژی کردوو، وە ئەو بەندایەتیانەشـی کـە تیایاندا ئەنجـام دەدرێت، وە پێیشـی ووت کە (تۆفان)ەکە واتـە لافاوەکەی (نوح) پێغەمبـەر کەی ڕوودەدات.

پاشـان لـە ڕۆژی هەینی وەفاتـی کـردوو فریشـتەکان بـۆن و کفنیان لە بەهەشـتەوە بـۆ هێناو سەرەخۆشـیان لە کوڕەکـەی کرد کە ناوی (شـیث)[٤]بوو سـەلامی خوای لێبێت.

ئادەم سـەلامی خـوای لێبێـت دوای هابیل کوڕێکـی تری بوو ناوی شـیث: أنـووش بوو، أنـووش- قینان، قینـان- مەهلائیـل، مەهلائیل- یرد، یـرد- ئەخنوخ (ئدریس سـەلامی خوای لێبێـت)، ئەخنوخ- متوشـلخ، متوشـلخ- لامک، لامک- (نوح سـەلامی خـوای لێبێت)، نـوح- سـام، حام،یافث، یـام، بـێ باوەڕبوو لە لافاوەکـە خنکا.

بـە تێڕامـان و وردبوونەوە لـەو ئایەتانەی کـە ئاماژەی پـێ دەکەین، خوای گەورەو میهرەبان لە نەبوونی ڕەها سـەرجەم بوونـەوەران و گەردوون و تەنانەت باوکە ئادەمیشـی دروستکردووە .

خودای گـەورە دەفەرموێ:(**قَـالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّـكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَـدْ خَلَقْتُكَ مِـن قَبْلُ وَلَـمْ تَكُ شَـيْئًا**).(مریم_ الآيـة ٩).واتە: پـەروەردگاری تـۆ هەر بەو شـێوەیە بڕیـاری داوە و فەرمویەتی ئـەو کارە لای من زۆر ئاسـانە، بەڕاسـتی پێشـتریش تۆم کـردووە، وەنەبێت شـتێك بوویبـێـت نەناوت هەبووە نـە بوون .

(تەفسیری ئاسـان-لاپەرە٣٠٥).

---

٤ (١) واتای ناوی (شث) بەخششی خودا

**(هَــلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَــانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْــرِ لَمْ يَكُن شَــيْئًا مَّذْكُورًا. (الأنســان_ الآيــة١)**. واتە: بەڕاســتی ماوەیەکــی زۆر لە ڕۆژگار بەســە ئادەمیــزاد دا هات کە شــتێکی وانەبــوو ناوببرێت. (تەفســیری ئاســان-لاپەڕە٥٧٨)

**(قُــلْ هَلْ مِــن شُرَكَائِكُم مَّن يَبْــدَأُ الْخَلْقَ ثُــمَّ يُعِيدُهُ قُــلِ اللَّهُ يَبْــدَأُ الْخَلْقَ ثُــمَّ يُعِيدُهُ فَــأَنَّىٰ تُؤْفَكُــونَ. (یونس _ الآیــة ٣٤)**. واتە: پێیان بڵێ باشــە ئایا لەو شــتانەی کــە ئێوە لــە جیاتی خــودا دەیپەرســتن کەســێك هەیە کــە بتوانێت شــتێك دروســت بکات لەســەرەتاوە، یان ئەگەر دروســتی کــردوو و دوایی نەما ئایا دەتوانێــت ســەرلەنوێ بیهێنێتەوە کایە؟ ئــەی پێغەمبــەر (دروودی خودای لەســەربێت) تــۆ بڵێ: هــەر خــودا، الله هــەر ئــەو دەتوانێت لەســەرەتا و نەبوونــەوە خەڵکــی و هەموو شــت دروســت بــکات و پاشــان دوای مردن و نەمــان دووبارەی بکاتــەوە، کەواتــوو چۆن لائەدرێــن لەهەق بەهــۆی درۆ و پڕوپاگەندەوە. (تەفســیری ئاســان- لاپــەڕە ٢١٣ ).

**(الَّــذِي لَهُ مُلْــكُ السَّــمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَــمْ يَتَّخِذْ وَلَــدًا وَلَمْ يَكُنْ لَــهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْــكِ وَخَلَــقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تقديــرا. (الفرقان_ الآیة ٢)**. واتــە: ئەو زاتەی ئاســمانەکان و زەوی موڵکی ئــەوە و هەر ئــەو خاوەنیانە کەسیشــی نەکردووە بــە ڕۆڵەی خۆی و کەســی نەکــردووە بە شــەریك و هاوبەش لەمــەودای موڵك و دەســەڵاتیدا، هەموو شــتێکی دروســت کردووە بــە ئەندازە و قەبارە و شــێوە و تــام و بــۆن و ڕەنــگ و جیــاوازی هەمەجــۆر، نەخشــەی ڕێــك و پێکی بۆ هەموو شــتێك داناوە(بەشــێوەیەك کە پێویســتییەکانی ئادەمیــزاد دابین بکەن و لە خزمەتی دابن. (تەفســیری ئاســان- لاپــەڕە ٣٥٩).

**(قُلْ مَــنْ رَبُّ السَّــمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ قُــلْ أَفَاتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِــهِ أَوْلِيَاءَ لَا يَمْلِكُــونَ لِأَنْفُسِــهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْــتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْــتَوِي الظُّلُــمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُوا لِلَّــهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَــابَهَ الْخَلْــقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللَّــهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُــوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّــارُ. (الرعد _الآیة ١٦)**.

واتــە: ئەی موحەمــەد(درودی خوای لەســەربێت) بــە (خوانەناســان) بڵێ:

کـــێ پـــەروەردگاری ئاســـمانەکان و زەوییە؟ (ئەگەر ئـــەوان بێدەنـــگ بوون) تۆ بڵـــێ اللـــە پەروەردگاریانـــە (چونکـــە ئەوانە کەڕ و کوێـــر و لاڵـــن لەوانەیە دان بەو ڕاســـتییەدا نەنێن) پاشـــان پێیـــان بڵێ: ئایـــا ڕەوایە جگە لەو خوایە پشـــت بە شـــتانی تر ببەســـتن و بیانکەنە پشـــتیوان و خۆشەویســـت، ئەوانـــە تەنانەت بۆ خۆشـــیان قازانـــج و زەرەریان بەدەســـت نییە؟ هەروەها بڵێ: باشـــە ئاخر کوێر و چاوســـاغ وەك یەکن؟ تاریکـــی و ڕووناکـــی چوونیەکن؟ (دیارە خوانەناســـی و بێدینـــی کوێری و تاریکییە، ئیمان و باوەڕ و خواناســـیش چاوســـاغی و ڕووناکییە)، بەڵکـــو چەند هاوبەشـــێکیان داناوە بۆ خوا، کە شـــتیان دروســـت کـــردووە وەك دروســـتکراوەکانی خوا و جا دروســـت کراوەکەیان لێ شـــێواوە، پێیـــان بڵێ: الله بەدیهێنەر و دروســـتکاری هەموو شـــتێکە و ئەو زاتە تاك و تەنها و بەدەســـەڵات و بەهێـــز و بەتوانایە. (تەفســـیری ئاســـان- لاپەرە٢٥١).

**لَّقَـدْ كَفَـرَ الَّذِينَ قَالُـوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِـيحُ ابْـنُ مَرْيَمَ قُلْ فَمَـن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَـيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِـيحَ ابْـنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَـن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَلِلَّهِ مُلْـكُ السَّـمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَـاءُ وَاللَّهُ عَـلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. (مائدة _الآية ١٧).**

واتـــە: ســـوێندبێت بێگومان ئەوانـــە بێباوەڕبـــوون کە وتیان: بەڕاســـتی خوا هەر مەســـیحی کـــوڕی مەریەمـــە، (ئەی موحەمـــەد) درودی خوای لەســـەربێت پێیـــان بڵـــێ: ئەگەر خوا بیەوێت مەســـیحی کـــوڕی مەریەم و دایکـــی و هەرچی لەســـەر زەویدا هەیـــە لەناوبەرێت، ئـــەوە کێیـــە لەبەرامبەر خواوە دەســـەڵاتی شـــتێکی هەیـــە؟ (کەواتە ئەویش و دایکـــی و ئەو خەڵکـــەش بەدیهێنراوی خودان و لـــە دەســـەڵاتی دەرناچن، ئیتر بـــە چ بەڵگەیەك قســـەی وانابەجـــێ دەکەن؟، بەمەرجێـــك) خـــوا زاتێکە هەرچـــی لە ئاســـمانەکان و زەوی و نێوانیـــان دا هەیە هەر ئـــەو خاوەنیانە، هەرچی بیەوێت دروســـتی دەکات (شـــتێکی ئاســـاییە ئەو زاتە (مەســـیح) بێباوك دروســـت بکات) چونکە خودا دەســـەڵاتی هەیە بەســـەر هەموو شـــتێکدا، (هەموو شـــت لای ئەو ئاســـانە).

وە ئـــەم بابەتە تا ســـنووری دەســـەڵاتی خوای گـــەورە لـــە زیندوکردنەوەمان ناوەســـتێت، بەڵکو خوای گـــەورە بە توانایە کـــە ڕەگـــەزی مرۆڤایەتیش بگۆڕێت بە دروســـتکراوی تـــر وە ئەمەش بە لای دەســـەڵاتی خوای گەورەوە زۆر ئاســـانە: وەک دەفەرموێـــت: **(أَيُّهَـــا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَـــرَاءُ إِلَى اللَّهِ * وَاللَّهُ هُـــوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ (١٥) إِن يَشَـــأْ يُذْهِبْكُـــمْ وَيَـــأْتِ بِخَلْـــقٍ جَدِيدٍ (١٦) وَمَـــا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّـــهِ بِعَزِيزٍ. (فاطـــر)**. واتە: (ئەی خەڵکینە ئێوە هـــەژار و نەدارن و هەمیشـــە ئاتاجی خودان، لـــە هەمـــوو کات و شـــوێنێکدا و بۆ هەمـــوو شـــتێك) هەرتەنها خوایـــە کە بێ نیـــازە و شـــایەنی سوپاســـە. ئەگەر بیەوێـــت ئیوە لەنـــاو دەبات و کەســـانی تر ســـەرلەنوێ دەهێنێتە کایەوە. (تەفســـیری ئاســـان- لاپـــەرە ٤٣٦).

لێـــرەوە خـــوای میهرەبان ئـــەم گـــەردوون و دروســـتکراوانەی لە خـــۆڕاو بۆ لەناوچوون دروســـت نەکـــردووە، وەهەروەها دەفەرموێـــت **(وَمَا خَلَقْنَا السَّـــمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَـــا بَيْنَهُـــمَا لَاعِبِينَ.** (الأنبيـــاء _ **الآية ١٦)**.

واتـــە: ئێمـــە ئاســـمان و زەوی، هەرچیـــش لەنێوانیاندایـــە بـــە گاڵتـــە (بێ مەبەســـت) دروســـتمان نەکـــردووە. (تەفســـیری ئاســـان- لاپـــەرە٣٢٣).

**(ثُـــمَّ إِنَّكُـــم بَعْـــدَ ذَٰلِـــكَ لَمَيِّتُـــونَ) .(المؤمنون _ الآيـــة١٥)**. واتـــە: بێگومان ســـەرەنجام ئێـــوە هەردەبێـــت بمرن(لەتوێـــی خاکـــدا دەبێـــت مەنـــزڵ بگرن). (تەفســـیری ئاســـان-لاپەرە٣٤٢).

**(وَمَـــا خَلَقْتُ الْجِـــنَّ وَالْإِنـــسَ إِلَّا لِيَعْبُـــدُونِ). (الذاريات _ الآيـــة٥٦)**. واتە: بێگومـــان من پـــەری و ئادەمیزادم دروســـت نەکـــردووە تەنها بۆ ئـــەوە نەبیت کە مـــن بپەرســـتن و فەرمانبەردارم بن. (تەفســـیری ئاســـان - لاپـــەرە٥٢٣).

لێـــرەوە ویســـتی خـــوای میهرەبان وابـــوو کە گەردوون دروســـت بـــکات وە مرۆڤ دروســـت بـــکات وە ژیانی دونیـــاش بکات بـــە شـــوێنی تاقیکردنەوە وە ژیانـــی دوارۆژیش بکات بە شـــوێنی پاداشـــت و مانـــەوە کەواتە دروســـتبوونمان بۆ ئامنجێکـــە، وە زیندوبوونەوەشـــمان راســـتیەکە هیچ گومانێکی تێـــدا نیە خوا دەفەرموێـــت **(يَا أَيُّهَـــا النَّاسُ** إِنْ **كُنْتُمْ فِي رَيْـــبٍ مِنَ الْبَعْثِ فَإِنَّـــا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ**

ثُـــمَّ مِـــنْ نُطْفَة ثُمَّ مِـــنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِـــنْ مُضْغَـــةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَـــيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَـــيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَـــاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَـــمًّى ثُـــمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُـــدَّكُمْ وَمِنْكُـــمْ مَنْ يُتَوَفَّى وَمِنْكُـــمْ مَنْ يُـــرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَـــيْئًا وَتَـــرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَـــإِذَا أَنْزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَـــزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَـــتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ) (الحـــج _الآية ٥).

واتـــە: (ئـــەی خەڵکینە ئەگەر ئێـــوە گومانتان لـــە زیندوبونـــەوە هەیە، ئەوە چـــاک بزانن کـــە ئێمـــە ئێوەمان لە خـــاک و خۆڵ دروســـت کردوە، لـــەوەو دوا (نەوەکان) لە نوتفەیەک (پەیدابوون)، پاشـــان نوتفەش دەبێتە خۆ هەڵواســـەرێک لەنـــاو منداڵداندا، لـــەوەو دوا دەبێتە گۆشـــتپارەیەکی تەواو و ســـەرو ســـیمادار یان ناتـــەواو، (هەموو ئەم شـــتانە دەهێنینـــەوە یادتان) تا بۆتـــان رون بکەینەوە کە ئێمـــە ئاوا ئێوەمان درســـتکردوەو دوبارە دروستکردنەوەشـــتان لامان ئاســـانە، ئـــەوەش بمانەوێت لـــە منداڵدانەکاندا جێگیـــری دەکەین، تا کاتێکـــی دیاریکراو، لەوەودوا بە ســـاوایی و بـــە بچوکی دەرتـــان دەهێنین (لە ســـکی دایکتان) دوای بۆ ئـــەوەی گەورە بن و بگەنـــە ئەو پەڕی هێـــزو تواناتان، هەتـــا نەدەمرێن رێن بـــە گەنجی، هەشـــتانە دەگەڕێنرێتـــەوە بـــۆ پەرپوتترینی تەمەنـــەکان، بۆ ئەوەی هیچ شـــتێک نەزانێـــت دوای ئەوەی جـــاران دەیزانی، (بەڵگەیەکی تریش لەســـەر زیندوبونـــەوە ئەوەیە کە ئەی ئینســـان) تـــۆ زەویش دەبینیت وشـــک و برنگە، جا کاتێک ئاوی بارانمان بەســـەردا بارانـــدن، دادەچەڵەکێـــت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکـــەرە دەکـــەن و ڕەگ و چڵ دەردەکەن و دەڕوێن، ئەوســـا لـــە هەموو جۆرە گـــژ و گیاو گوڵ و گوڵزارێکی جوان جووت دەڕوێنێت). (تەفســـیری ئاســـان لاپەرە ٢٣٢).



منتدى إقرأ الثقافي

# بنەچەو نەژادی مرۆڤ لە ڕووی زانستیەوە (وەچەو بەرەبابەکانی جیهان، وە بەرەبابی سامییەکان)

بـــە پشـــت بەســـتن بـــە زانســـتە جۆراوجۆرەکانـــی ئـــەم ســـەردەمە وەکو پەنجەمۆرو پشـــکنینی دی ئێن ئـــەی (DNA) دەتوانین بنچەو نـــەژادی مرۆڤەکان بدۆزینـــەوەو بـــە تێکڕایـــی بزانین لـــەچ ناوچەو وڵاتێکـــدا ژیـــاون، یەکێک لەو کۆمپانیـــا بەناوبانگانەی کە بەم کارە هەڵدەســـتێت کۆمپانیـــای (Ftdna) (فتدنا)ی ئەمریکیە. لە سەرتاســـەری جیهاندا بەم شـــێوەیەی خوارەوە نـــەژادو بنەچەکانیان دابەشکردووە:

١- کۆمەڵە نەژادی A A- HAPLOGROUP

ئەم گروپە بە شـــێوەیەکی دیاریکـــراوو تایبەت دەکەونە کیشـــوەری ئەفریقاوە بە تایبەت وڵاتانی ئەســـیوپیاو ســـودان، بە شـــێوەیەکی کەم لە ڕۆژئاواو باشووری ئەفریقیـــاش هەن، بە ڕێـــژەی (١،١))لە هەردوو کیشـــوەری ئەمریـــکا لە ڕەگەزی ئەفریقیـــن، بـــە ڕێژەی لـــە(٤١ ٪ ) جولەکەکانی (فلاشـــا) لـــەم کۆمەڵەیەن، وەبە ڕێـــژەی لە (١٤،٦٪ ) گەلی (ئەم هەر) لە ئەســـیوپیا لەم کۆمەڵەیـــەن، وە بەڕێژەی (١٠،٣٪ ) گەلـــی (ئۆرمـــۆ) لە ئەســـیوپیا بە هەمان شـــێوە لـــەم کۆمەڵەیەن، بەرزتریـــن ڕێـــژەی ئەم کۆمەڵەیە کـــە لـــە (٤٢،٥٪) دەکەوێتە وڵاتی ســـودانەوە.

٢- کۆمەڵە نەژادی B B- HAPLOGROUP

ئـــەم کۆمەڵەیە دابەش دەبێت بەســـەر چەنـــد گروپێکی بچـــوک بچوکدا (B1، B2) هەر لە کیشـــوەری ئەفریقادا ماونەتـــەوە زۆر بڵاوەیان نەکـــردووە، بەڕێژەی (٢،٣٪) کەوتونەتە هەردوو کیشـــوەری ئەمریکاوە.

٣- کۆمەڵە نەژادی C C- HAPLOGROUP

ئەم کۆمەڵەیە دابەش دەبن بەسەر چەند گروپێکدا (C1،C2،C3، C4،C5)

ئـــەم گروپانە وەچەکانیان لـــە وڵاتانی هیند و سریلانکا هـــەن، (C1وەچەکانیان تەنها لـــە وڵاتی یابان هەیە)، C2 لـــە وڵاتانی غینیای نـــوێ و میلانیزیا هەن، بەڵام


منتدى إقرأ الثقافي

C3 وەچەکانیان لە ناوەڕاستی کیشوەری ئاسیاوە بەو ڕێڕەوە بەستەڵەکەی کە لە چاخەکانی کۆندا هەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەمریکاکانی بەستۆتەوە بە یەکەوە کۆچیان کردووە بۆ هەردوو کیشوەری ئەمریکاکان، وەچەی هۆزەکانی مەغۆل کە جەنگیزخان لەوانە لەم گروپەن، گروپی C4 لە وڵاتی ئوستوڕاڵیا هەن واتە بنەچەی (بۆروجینز) کە خەڵکی ڕەسەنی ئەو وڵاتەن بەشی C5 ژمارەیان کەمەو تەنها لە وڵاتانی هیندو پاکستان هەن.

٤- کۆمەڵە نەژادی D- HAPLOGROUP D

ئەم کۆمەڵەیەش چەند گروپێکی لێدەبنەوە (D1، D2، D3)

بە زۆری لە ناوەڕاست و باشووری کیشوەری ئاسیاو مەنگۆلیا هەن D2 ئەم گروپە بەشێوەی دەستەی دابڕاو لە یەکتری لە نێوان دوانزە هەزار بۆ بیست هەزار ساڵ پێش ئێستا ژیاون و هەن، بە ڕێژەی لە (٣٥٪) لە وڵاتی یابانن و، وە بەرێژەی لە (٥٠٪) خەڵکی هەرێمی تبت لەم نەژادەن.

٥- کۆمەڵە نەژادی E- HAPLOGROUP E

ئەم کۆمەڵەیەش بنچەی زۆری لێبوەتەوە دابەش دەبن بەسەر چەند گروپێکدا، گروپەکانی (E1، E2، E3، E4) چەندین گروپی بچوک بچوکی لێ جیابووەتەوە، E لە ئەسیوپیا و E1، E2 لە باکوری رۆژهەڵاتی ئەفریقیا دەژین E4 زۆر زۆر کەم بووەتەوەو شایانی باس کردن نین.

بەشی بەهێزی ئەم گروپە E3ە ئەم بنەچەیە لە باکوری رۆژهەڵاتی ئەفریقیا دروست بوون، وە یەکێک لە نەوەکانیان E3a دەگەڕێنەوە بۆ قوڵایی و ناو جەرگەی ئەفریقیا وە ئەم بنەچەیە زاڵە بەسەر هەموو کیشوەرەکەدا، زۆرینەی ئەمریکییە بە ڕەگەز ئەفریقیاییەکان لەم بنەچەیەن .

هەروەها دەستە خوشکەکەیشی کە بنچەی E3b ئەم بەشەیش زۆرینەی ئەفریقیاییەکان لە باکوری رۆژهەڵات و باکوری رۆژئاوای کیشوەرەکە لەم بنەچەیەن، بۆیە زۆربەی میسریەکان و رەگەزی فیرعەونەکان و هۆزەکانی بەربەرو ئەمازیغیەکان واتە رۆژئاوای وڵاتانی عەرەبی لەم رەگەزەن. هەروەها

زۆرێک لە هاوڵاتیانی سـوماڵ و نەسـیوپیاش لـەم رەگەزەن.

ئەوەی جێگەی سەرسـوڕمانە ئەم بنەچەیە بە ئاڕاسـتەی باکور واتە کیشوەری ئەوروپاش رۆیشـتووە، بۆیە دەبینین لەناو نەتەوەکانی (ئەلبـان، مەکدۆنیا، یۆنان، سـربیا، بۆسـنە(ئەم ڕەگەزە بە رێژەیەکی بەرچاو هەیە).

زانایانـی بنەچەزانـی دەیگێرنەوە بۆ چەنـد قۆناغێک کە بووەتـە هۆی زیاد بڵاو بوونەوەی ئـەم ڕەگەزە:

**قۆناغـی یەکەم:** تێکەڵبوونی هـەردوو بنەچەی فینیقیەکان و (سـام)یەکان و. فینیقیەکان لە ناوچەی شـام نیشـتەجێ بوون، (سـام)ییەکان لەو بـەری دەریای سـپی ناوەڕسـت نیشـتەجێ بوون، ئـەم دوو بنەچەیـە بە هۆی تێکـەڵاوی و بازرگانـی لەگـەڵ یەکـتری واتە هاتوچـۆ کردنی بـەردەوام لەم بـەری دەریای ناوەڕاسـت بـۆ ئەو بـەری دەریا، بووەتـە هۆی پەڕینـەوەی ئـەم بنەچەیە بۆ کیشـوەری ئەوروپا.

**قۆناغـی دووەم:** قۆناغی شارسـتانیەتی ئیغریقی و رۆمانـی لەبەر گەورەیی و فراوانی ئەو پارچە زەویەی ئەم دوو شارسـتانیەتەی لەسـەر بەرپـا بوو مرۆڤەکان بواریـان زیاتر بۆ دەڕەخسـا بـۆ هاتوچۆ کردن لـە رۆژهەڵاتەوە بۆ کیشـوەری ئەوروپـا، ئەمەیـش یارمەتیدەر بـوو بۆ گواسـتنەوەی ئەم بنەچەیـە بۆ وڵاتانی ئەوروپا.

**قۆناغی سـێیەم:** قۆناغی فراوان بوونی شارسـتانیەتی ئیسـلامی رزگار کردنی ناوچـەکان و بـڵاو بوونەوەو جێگیـر بوون و جێنشـین بوونی لەشـکرەکان لەو ناوچانەی کـە ئازادیان دەکرد، هەندێـک جاریش کۆچکردنی مسـوڵمانان بۆ ئەو ناوچـە تازە ئازاد کراوانـە. بە وێنەی ئیسـپانیا و فەڕەنسـا و دورگەکانی دەریای ناوەڕاسـت ئەمەش هۆکارێکی تر بـوو بۆ بڵاو بوونەوەو گەیشـتنی ئەم بنەچەیە بۆ کیشـوەری ئەوروپا.

٦- کۆمەڵە نەژادی F- HAPLOGROUP       F

ئـەم کۆمەڵەیەش دابـەش دەبن بەسـەر (F1، F2، F*) وە ئەوانـەی کە لێی


منتدى إقرأ الثقافي

جیا بووەتـــەوە، دەکەونە نیمچە کیشـــوەری هیندیەوە، هەندێکی کەمیشـــیان لە (F*) کەوتونەتـــە وڵاتی پرتوگالـــەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئـــەو پەیوەندیەی کە هەبووە لە نێـــوان وڵاتی پرتوگال و ژێردەســـتەکانیدا.

٧- کۆمەڵە نەژادی G- HAPLOGROUP G

ئـــەم کۆمەڵەیـــەش دابەش دەبـــن بەســـەر (G*، G1، G2، G3، G4، G5) ئەم بنەچەیـــەش دروســـتْ بووە لـــە نێـــوان ناوچەیەکی داخـــراوی لە نێوان بەشـــی باکوری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاســـت و ناوچەکانی پاکســـتان و ئەفغانســـتان. هەندێک جار بـــەم گروپـــە دەوترێـــت گروپی قەوقـــازی: لـــە ٢٪ ی هاوڵاتیانـــی باکوری ڕۆژئـــاوای ئەوروپا لەم گروپـــەن، لە ١٠٪ خەڵکانـــی وڵاتانی (ئیســـپانیاو ئیتاڵیا و یۆنان و تورکیا) بە هەمان شـــێوە لـــەم بنەچەیەن، هەروەها لـــە ٣٠٪ جۆرجیەکان و ئازەربایجانیـــەکان و، لـــە ٥٠٪ ی ئیســـتۆنیای باکوورو، لـــە ١٨٪ دەروزیەکان و لـــە ١٠٪ جولەکەکانی ئەشـــکەناز و، لـــە ٢٠٪ جولەکەکانی وڵاتـــی مەغریب و لە ٩,٥٪ لـــە وڵاتی میسر بـــە تایبەتی بنەچـــەی مەمالیکەکان لەم کۆمەڵـــە نەژادەن. یەکێک لـــە بەناوبانگترین کەســـایەتیەکان کە ســـەر بەم بنەچەیەی ســـەرکردەی کۆچکردووی وڵاتی روســـیا (جۆزێف ســـتالین)ە .

٨- کۆمەڵە نەژادی H- HAPLOGROUP H

ئـــەم کۆمەڵەیـــەش پێکدێت لـــە (H*، H1، H2) بـــە تایبەتی چـــڵ و پۆپی زۆر لێبووەتـــەوە، ئـــەم لقە لە نیمچە کیشـــوەری هیندی لـــە دایکبووە، لـــە کاتێکدا لە ٣٥٪ ی هەمـــوو چینەکانـــی دونیا کـــە لە بنەچـــەی (دارفیـــدی)ن دەکەونە وڵاتی هیندســـتانەوە. ڕێژەی ٤٪ بەشـــتوون، ڕێژەی ٤٪ ئیترانیەکان، ڕێژەی ١٢,٥٪ ناجیەکان لـــەم بنەچەیـــەن، کۆچەریەکانی (قـــەرەج)ی ئەوروپاش لەم بنەچـــە نەژادەن.

٩- کۆمەڵە نەژادی I- HAPLOGROUP I

ئەم کۆمەڵەیەش دابەش دەبن بەسەر I1A، I1B، I1C

ئـــەم کۆمەڵەیە واتـــا کۆمەڵەی (I) بە هەر ســـێ بەشـــەکانیەوە (A، B، C) بە تەواوی ئەرووپین.

بەشی A:

ئـــەم بنەچەیە لــــە وڵاتانــــی ئەســـکەندەنافیا (ســـوید، دەنیـــمارک، نەرویج، ئایســـلەندا) دەژیـــن، ئەمەش بنەچـــەی (فایکنیـــج)ن واتا هاوڵاتیانـــی باکووری رۆژئـــاوای ئەوروپـــا، وە بە رێژەی کـــەم لە ناوچـــە جیاجیاکانی تری کیشـــوەری ئەوروپـــا هەن.

بەشی: B

ئەم بنەچەیـــە لە باکووری رۆژئـــاوای ئەوروپـــاو وڵاتانی بەڵقان و ســـەردینیا هـــەن، (زانســـتی نوێ ئـــەوەی دەرخســـتووە کـــە هاوڵاتیانی باکـــووری ئەوروپا بەشـــێکن لە جێرمـــان فایکنیج).

بەشی C:

ئەم بنەچەیەش بە زۆری لە وڵاتانی ئەڵمانیا و هۆڵەندا هەن.

-١٠ کۆمەڵە نەژادی J- HAPLOGROUP J

(بنەچە ســـامییەکان) ئـــەم کۆمەڵەیە پێـــی دەوترێت بنەچە (ســـامیە) نامۆکە چونـــەک (J ســـامی، بـــرای I، جەرمانی فایکنج)یـــە، هەرچی نەتەوە ســـامییەکان هەیـــە لە مانن. دابـــەش دەبن بەســـەر J*، J1، J2 بە نزیکی لە دەوروبەری ســـێ هەزار ســـاڵ پێش ئێســـتا لە وڵاتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاســـت دروســـت بوون.

- **یەکەم/ بنەچە نەژادی (J1):**

تەمەنـــی ئـــەم بنەچەیە لە دە هەزار ســـاڵ کەمـــتر نیە، لـــە ناوچەکانی وڵاتی یەمەن دروســـت بوون پاشـــان لە وێـــوە پەڕیوەتـــەوە وڵاتی ئەســـیوپیا دواتر بە شـــێوەیەکی زۆر لە دورگەی عەرەبی بـــڵاوەی کردوە، دواتـــر کۆچکردنی پێچەوانە روی داوە لـــە لایەن بابلیەکان و کلدانییەکانەوە لە دەوروبەری ســـێ هەزار ســـاڵ پێش زایین بۆ ناوەڕاســـت و ســـەرووی عێراق و وڵاتی شـــام.

گەورەتریـــن کۆچکردنیـــش بۆ ئەم بنەچەیـــە (J1) رووی دابێت لە ســـەردەمی ئـــازاد کردنـــە ئیســـلامیەکاندا رویـــداوەوە رووەو وڵاتانی عێراق و شـــام و میسرو باکـــووری ئەفریقیاو ئیســـپانیا بووە.

ئــەم بنەچەیــە پێــی دەوترێت بنچــەی نیمچە دورگــەی عەرەبــی و هۆزە عەرەبیەکان (قەحتانیــەکان و عەدنانیەکان) لەو هۆزانــە (حەمیر، کەهلان، موزر، قەیــس، رەبیعە، قەزاعە) هەر کەســێک هەڵگــری جیناتی (J1)ن بێــت، ئەوا لە وەچــەی یەکێک لەم هــۆزە عەرەبیانەیە. لە ســەدا ٣٩٪ ی فەلەســتینیەکان و لە ســەدا ٣٣٪ سوریەکان و لە ســەدا ٣٦٪ جەزائیریەکان و لە ســەدا ٣٣٪ تونسیەکان دەچنەوە ســەر ئەم بنەچەیــە، هەروەها لە نــاو هۆزە دەشــتەکیەکانی بیابانی نەقــەب و وڵاتی فەڵەســتین ڕیژەکە بــەرز دەبێتــەوە بۆ لە ســەدا ٦٥٪ - ٨٢٪ هەروەهــا لە عێــراق رێژەی لە ســەدا ٣٣٪، لــە وڵاتی میسر لە ســەدا ٢٠٪، ئەم بنەچەیــە بە پلــەی یەکەم دێت لــە وڵاتانی عێراق و شــام.

هەروەهــا لە وڵاتی میسریــش کە بە فــرە بنەچەیی ناسراوە کــە پانزە بنچەو نــەژاد لە خۆ دەگرێت، بنچــەی (J1) ڕێژەی ٢٠٪ ی وڵاتی میــسر پێک دەهێنێت، ئەمە لــە کاتێکدا بنەچەی فیرعەونــی رێژەی لە ١٨٪ ی ئەم وڵاتــە پێکدەهێنێت.

زۆرێــک لــەو ســەرژمێری و لێکۆڵینەوانــەی ســەبارەت بە زانینــی بنەچەو ڕەچەڵەکــی جولەکەکانی ئێســتاوە کە کراون ئاماژەی نامۆو ســەرنج ڕاکێشــیان نیشــانداوە. بۆ نمونــە لێکۆڵینەوەیان لەســەر تیرەی (کوهنیم) کردوە کە ســەر بە پەرستگای (ســەدن)ەو دەچنەوە ســەر هارون پێغەمبەر (ســەلامی خوای لەسەر بێت) وەکو زانــراوە جولەکە بــەو جولەکەیە دەوترێت کە دایکــی جولەکە بێت، بــەڵام ئەم تیرەی (کوهنیــم)ە لە لای باوکەوە دەچنەوە ســەر هــارون پێغەمبەر (ســەلامی خوای لەســەر بێت)، پشــکنینیان کرد بۆ جیناتی (کوهنیم الأشــکناز) واتە جولەکەکانی رۆژئاوا، وە (کوهنیم الســفردیم) واتــە جولەکەکانی رۆژهەڵات کە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕســتدان، دەرەنجامەکەی بەم شــێوەیە بــوو جوولەکەکانی رۆژئــاواو جوولەکەکانی رۆژهەڵات هیــچ پەیوەندیەکی جیناتی لــە نێوانیاندا نیە، وە نیــوەی هەردوو لایــان (واتە جولەکــەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا(دەچنەوە ســەر بنچــە نەژادی (J1) کــە جینــی عەرەبەکانــە. وە نیوەکەی تری دەچنەوە ســەر بنچەکانی تــر. لێرەوە دەردەکەوێت کــە جینی (J1) لە وڵاتــی ئیسرائیل دەگاتە

ڕێــژەی ٨,٣٪ کە ئەمانە دەچنەوە ســەر وەچــەی ئیبراهیم پێغەمبەر (ســەلامی خوای لەســەر بێــت)، وە ڕێــژەی ٩١,٧٪ جولەکەکانی ئێســتای وڵاتــی ئیسرائیل ناچنەوە ســەر نەوەی ئیسرائیل، بەڵکو دابەش دەبن بەســەر بنەچــە جیاجیاکانی جیهاندا.

• **دووەم/ بنەچە نەژادی (J2):**

ئــەم بنەچەیــە وا گومــان دەبرێت لە ناوچــەی باکوری (هیــلال الخصیب) [5] ناوچە بــە پیت و شــێوە مانگبەکە.

ئــەم بنەچەیە زۆر لە مێژەوە لە ناوەڕاســتی کیشــوەری ئاســیاو تــا دەگاتە ناوەڕاســتی وڵاتی ئێــران و وڵاتی هیندســتان بڵاوبۆتەوە، تەنانــەت لە هەندێک قۆناغــدا بنەچەی E3B گەیشــتووەتە ئەوروپا.

لێرەوە مســولمانە کوردەکان ڕێــژەی لە ٢٨,٤٪، جۆرجیــەکان ڕێژەی لە ٢٦,٧٪، تورکمانســتانیەکان لە ٢٧,٩٪، عێراقیەکان لە ٢٤٪، لوبنانیــەکان لە ٢٤٪، جولەکەی ئەشــکەناز بە ڕێژەی لە ٢٣٪، حولەکەی ســەفاردیم بە ڕێــژەی ٢٨,٦٪، ئێرانیەکان بە ڕێــژەی لە ٢٣٪، ئۆزبەکیــەکان بە ڕێژەی لــە ١٨,٤٪، پاکســتانیەکان بەڕێژەی لــە ١٤,٧٪، یۆنانیــەکان بە ڕێــژەی لــە ٢٠,٦٪، ئەلبانیەکان بە ڕێــژەی لە ١٩,٦٪ ئیســپانیەکانیش بە ڕێژەی لــە ١٦,٧٪ - لە ٢٩,١٪، وە هۆزی پشــتۆنە ئەفغانیەکان لە ٥,٢٪، پێکدەهێنن.

لە وڵاتی هیندســتان هــەردوو بنەچەی J2A، J2B2 کــە هەردووکیان لە بنەچە نــەژادی (J2)ن هەن، بێگومان ئەمــەش لە چاخە کۆنەکانداو بــە هۆی کۆچکردن و تێکەڵاویــەوە گەیشــتوونەتە ئــەم وڵاتە و شــوێن هاوڵاتیە ڕەســەنەکانی ئەو وڵاتەیان گرتووەتەوە.

ئــەم بنەچەیــە بەم ڕێژەیــە دابــەش دەبن لە وڵاتــی هیندســتان ڕێژەی لە ١٨,٦٪ لــە چینە بــەرزەکان، وە ڕێژەی لــە ٢١٪ لە چینی مامناوەنــدو، وە ڕێژەی

---

٥ ناوچەیەکی بە پیت و ئاوداره لە ئەنادۆڵەوە دەست پێدەکات تا ناوەڕاستی وڵاتانی کیشوەری ئاسیا دەڕوات و تا دەگاتە وڵاتی هیندستان، لە هەندێک قۆناغەکانیشدا گەیشتووەتە وڵاتانی کیشوەری ئەوروپا.

لــە ١٤٪ لە چینی خوارەوەی دانیشــتوان پێــک دەهێنن، وڵاتی هیندســـتان بەوە نــاسراوە کە زۆربــەی بنەچەو نــەژادەکان تیایدا بــەدی دەکرێت.

-١١ کۆمەڵە نەژادی k- HAPLOGROUP k

ئــەم کۆمەڵەیــەش لــە کۆمەڵــە بنەچەیــەک پێکدێــت، واتــە (K*،K1،K2،K3،K4،K5،K6،K6،K7) ســەرجەمیان لــە ناوەڕاســتی کیشــوەری ئاســیاو بە تایبەت ووڵاتــی ئێران، ئەم کۆمەڵــە گروپانــەش (N،M،L) لە کۆمەڵە گروپی (K) جیابوونەتەوە، تەنانەت ســەرۆکی پێشــووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریــکاش (تۆمــاس فریدمان) لــە کۆمەڵــە گروپــی (M19،K2).

-١٢ کۆمەڵە نەژادی O- HAPLOGROUP O

وا گومان دەبرێت ســەرەتای دروســتبونی ئەم بنەچەیە ڕۆژهەڵاتی ئاســیایەو ئەم چەنــد بەشــەی لێجیــا بوەتــەوە (O*،O1،O2،O3) گەورەتریــن لقی ئەم کۆمەڵەیــەش (O3) کــە زاڵتریــن و گەورەترین لقــە لە وڵاتی چیــن، گەورەترین بنەچــەی مرۆڤایەتیــە لە جیهانــدا، بــەڵام (O1، O2) لەم وڵاتانــە دەبینرێن کە دەکەونە باشــووری ڕۆژهەڵاتی ئاســیاوە، وڵاتەکان (مالیزیا، ڤێتنام، ئەندۆنیســیا، کۆریا، باشــووری چین) بە شــێوەیەکی گشــتی بنەچەی (O) گەورەترین بنەچەیە لــە جیهانــداو زاڵترین بنەچەیــە لە وڵاتــی چیــن، ئەگەرچی لــە ڕووی ڕێژەی دانیشــتوانەوە وڵاتی هیندســتان هاوتای وڵاتــی چین بووەتەوە، بــەڵام لە وڵاتی هیندســـتان یەک بنەچــەی زاڵ بــەدی ناکرێت بەڵکو فــرە بنەچەیە.

-١٣ کۆمەڵە نەژادی Q- HAPLOGROUP Q

شــوێنی لە دایکبوونــی ئەم کۆمەڵەیەش ناوەڕاســتی کیشــوەری ئاســیایەو کۆمەڵێــک لقــی لێدەبێتــەوە (Q،Q1،Q2،Q3،Q4،Q5، Q6*).

لقــی Q1 / لە وڵاتــی چین لەناو کەمینــەی (هەزار) دەبینرێــت، هەروەها لە وڵاتی ئەفغانســتان بە هەمان شــێوە بە ڕێژەیەکی کــەم دەبینرێت.

Q2/ لە ناوەڕاستی ناوچەی (سیبیریا) دەبینرێت.

Q3/ ئەمــە بنەچەی هیندیە ســورەکانە کە پەڕیوەتەوە بۆ هەردوو کیشــوەری

ئەمریکای باکورو باشـــور، ســـەرجەم هیندیە ســـورەکان لەم بنەچە نەژادەن.

Q5/ ئـــەم بنەچەیە لەنـــاو جولەکەکانی وڵاتی یەمـــەن بەرێژەیەکی کەم بەدی دەکرێت.

Q6/ بەرێژەیەکی کەم لە وڵاتی هیندستان هەن.

-١٣ کۆمەڵە نەژادی R- HAPLOGROUP R

پێکهاتەکانـــی ئـــەم کۆمەڵـــە نـــەژادە (R، R1، R2*)ن. دابەش دەبن بەســـەر چەنـــد لق و بنەچەیەکی بچوکـــدا، وا گومان دەبرێت، بنەچـــەی (R1a) لە باکوری دەریاچەی ڕەش لە وڵاتی روســـیا دروســـت بـــوون دواتر بە ئاڕاســـتەی رۆژهەڵات و باشـــوری ئەوروپا رۆیشـــتووەوە هەروەها لە وڵاتی هیندســـتانیش دەبینرێت.

(R1b)بـــە هەمـــان شـــێوە لـــە رۆژئـــاوای ئەوروپاش بـــڵاو بۆتـــەوەو پێیان دەوترێت بنەچـــە (هیندۆ ئەوروپیەکان)، لـــەم وڵاتە ئەوروپیانـــەدا ئەم بنەچەیە رێژەی لـــە ١٠٠٪ پێک دەهێنن (ئیرلەندا، بەریتانیا، ئیســـپانیا، فەرەنســـا، ئەڵمانیا) بەشـــێوەیەکی گشـــتی نەتەوەکانی رۆژئـــاوای ئەوروپا لەم بنەچەیـــەن، هەروەها پێی دەوترێـــت بنەچەی زەریای ئەتڵەســـی.

بنەچەی (R2) لە باشـــوری کیشـــوەری ئاســـیاو بە تایبەت لە وڵاتی هیندستان دەبینرێت.

لە دورگەی (ســـقلیە) ســـەرەرای بچوکیەکـــەی بەڵام کۆمەڵێ بنەچـــەی تێدایە لەوانە:

J2/ بەرێژەی لە ٢٦,٨٪ بنەچەی دەریای ناوەڕستی.

R1b/ بەرێژەی لە ٢٥,٨٪ بنەچەی ئەتڵەسی و هاوڵاتیانی رۆژئاوای ئەوروپا.

E3b/ بەرێژەی لە ٥,١٥٪ بنەچەی باکوری کیشوەری ئەفریقیا.

G/ بەرێژەی لە ١١,٣٪ بنەچەی قەوقازی یان ئەستۆنی .

I1b/ بەرێژەی لە ٨,٢٪ بنەچەی جەرمانی بەلقانی.

K/ بەرێژەی لە ١٪ بنەچەی فارسی کۆن.

لە یەکێک لەو لێکۆڵینەوە سەرنجڕاکیشـــانەی کە لەوڵاتی داغســـتان ســـەبارەت

بە نـــەژاد و بنەچـــەکان کـــراوە دەرئەنجانی چـــاوەڕوان نەکـــراوی لێکەوتۆتەوە، لێکۆڵینەوەکە لـــە لایەن بەڕێز (ئۆرفینۆ ئەریکۆ) لە ژێر سەرپەرشـــتی پرۆفیســـۆر (جۆرجیۆ باولـــی) ئەنجامدراوە.

دەرەنجام بەم شێوەیە بووە:

- نەتەوەی لاکس بنەچەی J1 بەڕێژەی لە ٤٣٪ .
- نەتەوەی شیشان بنەچەی J1 بەڕێژەی لە ٦٠٪ .
- نەتەوەی ئافارۆ بنەچەی J1 بەڕێژەی لە ٨٠٪ .
- نەتەوەی کۆباتشی بنەچەی J1 بەڕێژەی لە ٨٦٪ .

لێـــرەوە بۆمـــان دەردەکەوێـــت جینـــی عەرەبـــی J1 بـــە ڕێـــژەی لـــە ٧٠٪ دەردەکەوێـــت، لە کاتێکدا نێوانی دورگەی عەرەبی و ئەم وڵاتە ئیســـلامیانە ســـەر بە یەکێتـــی ســـۆڤیەتی جاران بـــووە هـــەزاران کیلۆمەترە.

هەروەهـــا لێکۆڵەری لوبنانـــی دوکتۆر. بیرزەلوع هەســـتاوە بـــە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیـــەک بۆ زانینی بـــە ناوبانگتریـــن بنەچەکانی وڵاتی لوبنـــان، لێکۆڵەر هـــەزار نمونـــەی جینی وەرگرتـــووە لە کۆی (٤) ملیـــۆن ژمارەی دانیشـــتوانی ئەم وڵاتە، ڕێژەکـــەش بەم شـــێوەیە بووە:

- بنەچـــەی (G) بـــە ڕێژەی ســـەدی لە ٦٪ کـــە ئەمەش بنەچـــەی قەوقازی و مەمالیەکانە.
- بنەچـــەی (J1) بـــە ڕێژەی ســـەدی لـــە ١٩٪ کـــە ئەمەش بنەچـــەی نیمچە دورگـــەی عەرەبیە.
- بنەچـــەی (J2) بە ڕێژەی ســـەدی لە ٢٥٪ کە ئەمەش بنەچەی دەریای ســـپی ناوەڕســـتە کە (ڕۆمان و فینیقیـــەکان و ئیغریق، هەندێ لە ئێـــران و هیند وهتد..) لەم بنەچەیەن.
- بنەچـــەی (E1b) بە ڕێژەی ســـەدی لە ١٧٪ کە ئەمـــەش بنەچەی ڕۆژهەڵاتی کیشـــوەری ئەفریقیان کە وڵاتانی (ئەســـیوپیاو کینیاو ڕەش پێســـتە ئەمریکیەکان) لەخۆدەگرێـــت. هەروەها فیرعەونەکان و بەربەرو نەتـــەوە عەرەبە لە ناوچووەکان

و هکســۆس به هەمان شــێوه له خۆدەگرێت.

- بنەچـــەی (I) به ڕێژەی ســـەدی له ٤,٥٪ کـــه ئەمەش بنەچـــەی جەرمانی و بەلقـــان و فایکنیج کەوا پێشـــبینی دەکرێت که کاتی هەڵمەتی خاچ پەرســـتەکاندا ها تبێت.

- بنەچـــەی (R) بـــه ڕێژەی ســـەدی له ١٣٪ کـــه (R1b) تێدایه کـــه بنەچەی ئەتڵەســـیەو له کاتـــی هەڵمەتی خاچ پەرسـتەکاندا که له لایەن وڵاتانی فەڕەنســـا و بەریتانیـــاو ئەڵمانیـــادا هاتووز بـــۆ ئەم وڵاتـــە، هەروەها بنەچـــەی (R1a) له وڵاتـــی لوبنـــان دەبینرێن کـــه له بنەڕەتـــدا بنەچەیەکـــە له ڕۆژهەڵاتـــی باکوری دەریـــای ڕەش بڵاو بووەتەوەو پاشـــان بەرەو وڵاتانی پاکســـتان و ئێـــران و تورکیاو ڕوســـیاو ئۆکرانیا ڕۆیشـــتووە و پێی دەوترێت بنەچەی (ســـەلافەیە).

- ئەمـــەش بـــە ناوبانگتریـــن بنەچەکانە له وڵاتـــی لوبنان و هەنـــدێ بنەچەی بچوکی تری تێدایـــەو هاوکات ئەم لێکۆڵینەوەیەش زۆر نزیـــەک له لێکۆڵینەوەکەی لێکۆڵەری ئیســـپانی که نـــاوی (کارلۆس)ە[٦].



٦ تەماشای پەرتووکی (الحمض النووي) علي محمد الشحي بکە، که باس له جینی عەرەبی دەکات.

# . ڕەگەز پەرستی و جیاکاری

- من جیاوازم لەوانی تر کەواتە من هەم
- رەگەزپەرستی و جیاکاری دوو دیوی یەک دراون
- دیاردەی ڕەگەزپەرستی لە نێوان کۆمەڵگەکان و نەتەوە کۆنەکاندا
- دیاردەی ڕەگەزپەرستی لە مێژووی نوێدا



منتدى إقرأ الثقافي

# ڕەگەز پەرستی و جیاکاری دوو دیوی یەک دراون

لــە زۆربەی کۆمەڵگــە کــۆن و نوێیەکاندا زۆربــەی مرۆڤــەکان وای دەبینن کــە جیاوازیان لــە غەیری خۆیــان نهێنی بوونیانــە، هەندێک کەس پێی خۆشــە ئــەو وتەی دیــکارت بڵێتەوە کــە دەڵێت (مــن بیردەکەمەوە کەواتــە من هەم) هەندێــک پێیان خۆشــە بڵێن (من جیــاوازم کەواتە مــن هەم).

جیاوزابــوون لــەوی تــر یەکــەم هەنــگاوی ڕەگەز پەرســتیە بــە هەموو جۆرەکانیەوە لە ڕوانگەی ئاین و ڕەگەزەوە لە ئاســتی وڵاتان و کۆمەڵگاکانیشــەوە.

هەمــووان دەزانیــن کە بناغەو ئەســڵی مــرۆڤ یەکە!!! کەواتە بەچ شــتێک جیاواز بین لــە یەکتری.

ئــەوان زۆر شــت دادەهێنــن و (خوێنی پــاک)ن پێیــان وایە کە ئــەوان لە بنەچــەی ئێســتای مرۆڤایەتی نین و لــە هەســارەیەکی ترەوە هاتــوون، وەکو چــۆن جولەکــەکان دەڵێــن ئێمە لە بنەچــەی ئــادەم پێغەمبەر نین (ســەلامی خــوی لێبێت) ئێمە (ســامین) واتە ڕەگەزێکــی ترین جیاواز لە ڕەگەزی ئێســتای مرۆڤایەتــی، هەندێــک بە هەڵە تێگەیشــتوون کە گوایە مەبەســت لە (ســام)ی بــوون چوونەتەوە ســەر وەچەی (ســام)ی کــوڕی نوح.

مەبەســت لە جیاکاری و ڕەگەز پەرســتی لە داب و نەریتە نوێیەکاندا جیاوازی کردنە لــە نێوان ڕەگــەزی مرۆڤەکاندا لە یاســاکان و مامەڵەکان لەســەر بناغەی خوێن کــە پەیوەندیدارە بە پێکهاتەی لاشــەی مرۆڤەکانەوەو پاشــان ژیانی هزری و ســیماو دیاردە کۆمەڵایەتیەکان بــە دوای خۆیدا دەهێنێت.

زانایانــی زانســتە مرۆییەکان پۆلێنکاریان بــۆ ڕەگەزەکانــی مرۆڤایەتی کردوە، هــەر ڕەگــەزەو تایبەتمەندی بۆماوەیــی خۆی هەیە بــە جۆرێک لــە جۆرەکان جیاییەک لــە نێوان مرۆڤەکانــدا دروســت دەکات، دیارترین ئــەو تایبەتمەندیانە ڕەنگی پێســت و شــێوەی پەیکەرە ئێســک و باڵا بەرزی و شــێوازی دەم و چاوو هتــد ... لێرەوە وتراوە ئەم سروشــتە جیــاوازی لە بەهرەکان و ژیــری و دەروونی دروست دەکات.

لەسەر بناغەی ئەم دابەشکاریە رەگەز پەرستیە لێکۆڵەرەوان بڕیاریان داوە کە وا جیاوازی لە نێوان رەگەزە جیاوازەکاندا هەیە، لێرەوە رەگەزە باڵاکان مافی ئەوەیان هەیە کە یاسای تایبەت بە خۆیان هەبێت و مامەڵەی تایبەت بکرێت لەگەڵیاندا و نابێت رەگەزەکانی تر بەشداربن لەم یاساو ڕێسایانەدا.

ئەمە چەمکی جیاکاری و رەگەز پەرستیە لە رێنماییە نوێیەکاندا بێگومان ناڕاستی ئەم بۆچوونانەش دواتر روون دەکەینەوەو، وە ئەم مەبەستانەش کە لە پشت ئەم بۆچوونانەوەیە.

بیرۆکەی جیاکاری بە شێوەیەکی گشتی لە کۆنەوە لە نێوان مرۆڤەکاندا هەبووە، بۆ نمونە جیاوازیان لە رووی بە هێزی لاشەو ژێری و دەوڵەمەندی و هەژاری و زۆر دیاردەی تری ژیانی بوونەتە هۆکاری باڵادەست بونی دەستەیەک بەسەر ئەوی تردا، یان بەهێزەکان لاوازەکانیان دەچەوساندەوە، گەورەترین ئەم دیاردانەش دیاردەی کۆیلایەتی بوو!

## دیاردەی ڕەگەز پەرستی لە نێوان کۆمەڵگاکان و نەتەوە کۆنەکاندا

لە وڵاتی هندستان لە پەڕاوە پیرۆزەکانیاندا بڕیار لەسەر جیاکاری لە نێوان مرۆڤەکاندا دراوە بە گوێرەی ئەو رەگەزانەی کە لێی دروست کراوە بە بۆچوونی ئەوان: دەڵێن هۆزی بەرهەمیەکان لە دەمی خوای گەورە دروست کراوەو بەڕێزترینی دروستکراوەکانن وە هەرچی پلەو پایە باڵاکان هەیە بۆ ئەوانە، وە هۆزی (کشتری) یەکان لە باڵی خوا دروست کراون و هەرچی کارو بارە سەربازیەکان هەیە بە ئەوان دەسپێردرێت، وە هۆزی (فیشائیەکان) یان - فاشا- لە ڕانی دروستکراوە و ئەوانە دەبێت هەر کار بکەن، هەروەها هۆزی (سوردائیەکان) لە پێی دروستکراون ئەوان تەنها یەک کاریان هەیە ئەویش خزمەتکردنی چینەکانی پێشووترە.

یۆنانەکان باوەڕیان وابوو کە ئەوان گەلی هەڵبژاردەی خوان، لە ڕەگەز گەلێک دروست کراون جیاوازن لەو ڕەگەزانەی کە میلەتەکانی تری

لــێ دروســتکراوە، وە بـــە نەتەوەکانی تریـــان دەوت (بەربەر). فەیلەســوفی بەناوبانگــی یۆنـــان لـــە پەڕتوکی (السیاســة)دا بڕیار لەســـەر ئـــەوە دەدات کـــەوا خوداوەند دوو گـــروپ مرۆڤی دروســتکردوە گروپێک ویســـت و ژیری پێبەخشــیوە ئەوەش گەلــی یۆنانـــە، خوداوەند بەم شــێوە تەواوە دروســتی کــردوە بۆ ئەوەی جێنشــینی ئەو بێت لەســـەر زەوی و، وە گەورەی ســـەرجەم مرۆڤـــەکان بێــت، وە گروپەکەی تـــر کە (بەربـــەری) یـــان (بەربەریەکان)یان پێدەوترێت ئەمانە تەنها هێزی جەســـتەو لاشـــەیان پێدراوە و بـــۆ کار پێکردن و کۆیلایەتی دروســـتکراون بە بڕوای یۆنـــان جگە لە خۆیان هەمـــوو میلەتەکانی تـــر (بەربەرین).

لێرەوەیـــە کـــە کۆیلایەتی کـــردن و بازرگانی کـــردن بە مرۆڤـــەوە وەکو کاڵاو شـــمەکەکان تەماشـــاکراوە، جگە لە خۆیان کەســـی تریـــان بە مـــرۆڤ نەزانیوە.

رۆمانەکانیـــش بە هەمان شـــێوە خۆیـــان بە گـــەورەی جیهـــان و مرۆڤایەتی دەزانی و کەســـانی تریان بە (بەربەر) دەزانی، بە یاســـا کۆیلایەتیان چەســـپاندبوو، وەکـــو کاڵاو شـــمەک مامەڵەیـــان بە مرۆڤـــەوە دەکردو بە نەشـــیاوترین شـــێوە مامەڵەیان لەگەڵـــدا دەکردن.

عەرەبەکانیـــش لە کۆندا زۆر شـــانازیان بە خۆیـــان و باوباپیریانـــەوە دەکردو زمان و خوێنـــی خۆیان زۆر بە پاک و پیرۆز دەزانی و تەنانەت ژن و ژنخوازیشـــیان جگە لـــە خۆیان پێ باش نەبـــوو لەگـــەڵ نەتەوەکانی تردا، بەوانـــی تریان دەوت (عەجەم).

جولەکەش بانگەشـــەی ئەوە دەکـــەن کە ئەوان گەلی هەڵبـــژاردەی خودان، وە ئەو خودایەی کە ئەوان دەیپەرســـتن نابێت پەرســـتراوی کەســـانی تـــر بێت، وە بە کەســـانی تریان دەوت (نـــەزان و نەفام). لـــە قورئاندا خوای گـــەورە ئەم وتەیانی تۆمـــار کردوە: (وَقَالَـــتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَىٰ نَحْـــنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّـــاؤُهُ) (المائدة_١٨). جولەکـــەو گاور دەیانـــوت: ئێمـــە رۆڵەی خواو خۆشەویســـت و نزیکـــی ئەوین. (تەفسیری ئاسان_لاپەرە١١١).

لــە لای جوولەکانیــش بە کۆیلە کــردن بە ڕەوا بیــنراوە، تەنانەت لــە کاتێکدا کەســێک لە توانایــدا نەبووایە قەرزەکــەی بداتەوە لە لایەن خــاوەن قەرزەکەوە بە کۆیلــە دەکرا.

لــە ئاینی مەســیحیەتدا بــە هەمان شــێوە کۆیلایەتــی بە ڕەوا بیــنراوە و لە یەکێــک لە کتێبە بــە ناوبانگەکانیاندا بە نــاوی (لاروس) کە لە ســەدەی نۆزدەدا بڵاوکراوەتــەوە ڕەوایەتــی دەدات بە کۆیلە کردنــی ئەوانی ترو مانــەوەی لەناو جیهانی مەســیحیەتدا[٧].



٧ (١): قاموسی کتێبی مقدس / د. جورج یوسف

## دیاردەکانی رەگەزپەرستی لە مێژووی نوێدا

بــە درێژایی مێژوو رەگەز پەرســتی هۆکار بووە بۆ داگیــرکاری و پاوانخوازی و دەست بەســەرداگرتنی ناوچەکانی یەکتری و لێرەوە کوشــت و کوشتارو لەناوبردن و ئاوارەکردنی یەکتر دەســت پێدەکات.

هەمــوو مێــژوو نووســان و شــارەزایان یەکدەنگن لەســەر ئــەوەی هەموو تاوانــکاری و لەناوبردنــە بــە کۆمەڵــەی لە دژی هاونیشــتیمانیە رەســەنەکانی هــەردوو کیشــوەری ئەمریکا بەرپاکرا ئــەو خەڵکانەی کە پێیــان دەوترا (هیندیە ســورەکان)، بەڵام ئێســتا لــە جیهانی نوێــدا بــەم رەفتارانە دەوترێــت پاکتاوی رەگــەزی و لەناوبردنــی بەکۆمەڵ.

ســەیر لەوەدایە بۆ ئەم رەفتارانەیان پاســاوی یاســایی نوێیان بۆ دادەڕشــت واتــە بۆ ملکەچ پێکــردن و داگیرکاریەکانیان یاســای تازەیان دادەهێنــا... (ئیریکا ئیرین دایــس) بەرپرس و بڕیــاردەر لە تیمی نەتــەوە یەکگرتووەکان ســەبارەت بە هاونیشــتیمانیە کۆن ورەســەنەکانی سەر زەوی دەڵێت یاســاکانی (دۆزینەوە)، (داگیــرکاری)، (ئــەو زەویانەی موڵکــی کەس نین) بنەماکانی ئەم ســێ یاســایە بوونە هــۆکاری لێســەندنەوەی موڵکایەتــی لە هاوڵاتیــە رەســەنەکانی ناوچە جیاجیاکانــی جیهــان، بێگومان تا ئێســتاش ئیســتیعماری کۆن و نوێ بەم ســێ یاســایانە کاردەکەن.

لە ســەدەی پانزەدا بە دیاریکراوی دوو بڕیاری پاپای مەســیحیەکان ڕیخۆشکەر بوون بۆ جیهانی مەســیحی کە پەلامــاری هەموو وڵاتانی جیهان بــدەن (ئەوانەی کە مەســیحی) نین داگیریــان بکەن و دەســت بەســەر زەوی و زارو خێرو بێری ئــەو وڵاتانەدا بگرن:

١. ئەو فەرمانەی کە پاپا (نیکۆلاس)ی پێنجەم دەری کرد بۆ پاشــا (ئەلفونســو) ی پێنجەم پاشــای پرتوگال ســاڵی (١٤٥٢) ز، ڕیگەی پێدا کــە داگیرکاری و جەنگ هەڵبگیرســێنێت لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە مەســیحی نین.


منتدى إقرأ الثقافي

٢. ئــەو فەرمانــەی کــە پاپا (ئەلیکســاندەر)ی شەشــەم لە ســاڵی (١٤٥٣)ز دەری کرد بۆ پاشــای ئیســپانیاو شــاژنەکەی بێگومان ئەمەش دوای گەشــتەکەی (کریســتۆڤەر کۆلۆمبــۆس) بوو کــە کۆمەڵێک دورگــەو هەردوو کیشــوەرەکانی ئەمریــکای دۆزیــەوە، بە گوێــرەی ئەم بڕیارە دەبێت ســەرجەم جیهــان ملکەچ بێت بۆ دەســەڵاتی مەســیحیەکان و هەرچی خەڵکی ئەو ناوچە تــازە دۆزراوانەو موڵــک و زەوی و زاریــان هەیە دەبێت لە ژێــر فەرمانی ئەواندا بێــت، بەو پێیە هەمــوو جیهان و ئەو زەوی و شــوێنانەی کە دۆزراونەتەوە، یــان نەدۆزراونەتەوە لــە نێوان ئیســپانیاو پرتــوگال دەکرێن بە دوو بەشــەوە واتە لایەکــی جیهان بۆ ئیســپانیاو لایەکەی تری بۆ پرتــوگال!!! دواتر لــە ســاڵی (١٤٩٤) ز پەیماننامەی (توردیســیلاس) گرێدرایــەوە لە نێــوان هەر دوو وڵاتــدا زۆرێک لــە وڵاتەکانیان دابــەش کــردەوە لە نێــوان خۆیانــدا، بۆیە لــە کیشــوەری ئەمریــکای لاتینی تەنهــا وڵاتــی بەرازیل بە زمانــی پرتوگالی گفتوگــۆ دەکەن لە کاتێکدا ســەرجەم وڵاتەکانــی تر بە زمانی ئیســپانی ئاخاوتــن دەکەن.

ســەرباری داواکردنی هاوڵاتیانی ناوچــە دۆزراوەکان و هاوکات چوونە ســەر ئاینی بە مەســیحی، بەڵام هێشــتا کەنیســە ئەم دوو بڕیارەی هەڵنەوەشــاندەوە، دواجــار ئــەو یاســایانەی کــە دایاننابــوو بــۆ خۆیان ســەبارەت بە دەســت بەســەرداگرتنی ناوچە تــازەکان و داگیرکردنیان بوون بە بناغەی یاســاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.

هەمــوو ئەم یاســایانە هۆکاربــوون بۆ داگیرکاری و دەســت بەســەرداگرتنی زەوی و زاری ئــەو ناچــەو وڵاتانەی کــە دەدۆزرانــەوە بە بیانــووی ئەوەی کە دانیشــتووانی ئەم ناوچانە مەســیحی نین یان بێبــاوەڕن، یان ئــەو زەویانەی کە موڵکی کەس نین، مەترســی ئــەم یاســایانەو بەرکاربوونی تــا ڕۆژگاری ئەمڕۆش بەردەوامــەو هــەر کاتێــک بیانەوێــت موڵکایەتــی و مافی خــاوەن دارێتی لە هاونیشــتیمانیە ڕەســەنەکان وەردەگرنەوە !!!

لە دونیای نوێشــدا، داگیرکاریەکان لە لایــەن زلهێــزە ئەوروپیەکانەوە ئەنجام

دران و بوونــه هۆی لەناوچوونی هاوڵاتیە رەســەنەکان یاخــود ژمارەیان ئەوەندە کــەم بووەتەوە بوونەتە کەمینە لــە وڵاتەکانی خۆیاندا بۆ نمونە ڕەش پێســتەکانی کیشــوەری ئوســتورالیاو هیندیە ســورەکان لە وڵاتی ئەمریکا رێژەیــان زۆر کەم بۆتەوە.

هاوکات لــە کیشــوەری ئەفریقیاش ژیــان و گوزەرانی هاوڵاتیە رەســەنەکان بــەرەو لەناوچــوون دەڕوات، دانیشــتووانی ناوچە دارســتانیەکانی ناوەڕاســتی ئەفریقیــا کە پێیشــیان دەوترێــت کورتەبــاڵاکان ژیانیان لە مەترســیدایە، هۆزە شــوانکارەکان (ماســای، ســامبور) لە رۆژهەڵاتی ئەم کیشــوەرە لە ئێســتادا نە ژیــان و گوزەران بۆخۆیــان و نە لــەوەڕگاش بــۆ ئاژەڵەکانیان دابیــن نابێت .... هەروەها (ســانیەکان، بوشــمان) لە باشــووری ئەفریقیا ئەم هۆزانە زۆربەی زەوی و زارەکانیــان لەدەســتداوە ... هۆزی (ئەمازیــغ) لە باکوری ئەفریقیــا لە بیابان و هەنــدێ ناوچە شــاخاویەکان دەژیان بەڵام ئێســتا بەرەو توانــەوەو لە ناوچوون دەڕۆن... دەرەنجامــی خراپی ئەم هەڵســوکەوتانە بریتی بوون لــە وەدەرنانی ئەم خەڵکــە رەســەنانە لە زێدی خۆیــان هەندێک جار لە ژێر ناونیشــانی پاراســتنی دارســتانەکان یان پاراســتنی ئاژەڵەکان بەم پاســاوانە ئــەم تاوانانەیــان ئەنجام دەدا .. توانــەوەو نەمانــی کەلتــورو شارســتانیەت و ئاینــە جۆراوجۆرەکانی ئەم خەڵکــە رەســەنانە، هەڵگرتنەوەی منداڵەکانیان لە لایەن ســپی پێســتەکانەوە لە ئوســتورالیاو کەنەدا بە بیانووی جــۆراو جۆرو دواتر ســڕینەوەی داب و نەریت و کەلتــوری ئەم منداڵانــەو بێبەش کردنیان لە ســۆزی دایک و باوکیــان هاوکات بە زۆر کارپێکردنیان .. یان ســزادانی جەســتەیی و جنســی و هتد ... تا ئەم ساڵانەی دوایــی بەم شــێوازە دور لــە مرۆڤایەتیە هەڵســوکەوت کراوە لەگــەڵ هاوڵاتیە رەســەنەکانی ناوچە جۆراوجۆرەکانی ســەر ئــەم زەمینە.

لە ســاڵی (١٩٧٠)ز لیژنەیەکی لاوەکی لــە نەتەوە یەکگرتــووەکان پێکهێنرا بە ســەرۆکایەتی (مارتینز کوبو) کــە خەڵکی وڵاتی ئیکوادۆرە بۆ نوســینی راپۆرتێکی تێــرو تەواو لەم بارەیەوە، لە ســاڵی (١٩٨٤)ز ئــەم لێکۆڵینەوەیە تــەواو بوو لەم

راپۆرتـــەدا بـــاس و خواســـی وای تێدایە مرۆڤ شـــەرم دای دەگرێـــت بڵێ من لە ســـەدەی بیســـت و یەکدا دەژیم ؟؟ ئەم لێکۆڵینەوەیە ڕێخۆشـــکەربوو بۆ سازدانی کۆنگرەیەکی گەورە ســـەبارەت بە هاونیشـــتیمانیە رەســـەنەکان لە ساڵانی (١٩٩٥-٢٠٠٤) وە نەتـــەوە یەکگرتووەکان خۆی سەرپەرشـــتی دەکرد، بۆ چارەســـەر کردنی هەموو ئـــەم گرفتانە کـــە رووبەڕووی هاونیشـــتیمانیە رەســـەنەکانی ئەم ســـەر زەمینە بۆتەوە

ئێســـتا لە وڵاتانـــی ئەسـکەندەنافیا هاوڵاتیە (ســـامییە) رەســـەنەکانی ئەوێ رێکخـــراوی پەرلەمانتـــاری تایبەت بـــە خۆیان دروســـتکردووە.

لە وڵاتـــی کەنەداش لە ســـەرەتای حەفتاکانـــەوە لە هەوڵدابوون تا لە ســـاڵی (١٩٩٩) هەرێمێکیـــان بـــە نـــاوی (نونافوت) جیاکـــردەوە کە لـــە (٨٥٪) هاوڵاتیە رەســـەنەکانن ئێســـتا تێیدا دەژیـــن و مافەکانی خۆیان بەدەســـت هێنا .

وڵاتی کەنـــەدا ناچاربـــوو قەرەبوو و باربـــووی هەموو ئەو هەڵەو ســـتەمانە بکاتـــەوەو چەند یاســـایەکی لەوبـــارەوە دەرکـــرد لەوانـــە یاســـای (گێڕانەوەی کەرامەت)، یاســـای (پلانـــی کارکردن بـــۆ هاوڵاتیە رەســـەنەکان).

رەش پێســـتەکان لە وڵاتـــی ئەمریکا لـــە ماوەی رابـــردوودا هەمان ســـتەم و چەوســـاندنەوە بەرامبەریـــان کراوەو ســـەرجەم مافەکانیان پێشـــێل کـــراوە، کار گەیشـــتووەتە ئەوەی کـــە چەندیـــن کاری نەشـــیاو بەرامبەریان کـــراوەو بێبەش کـــراون لە ســـەرەتایی ترین مافەکانیـــان !! بە هەمـــان شـــێوەی ناوچەکانی تری سەر زەوی دەســـتیان کرد بە خۆپیشـــاندان و دروســـتکردنی چەندین رێکخراوەی تایبـــەت بە خۆیـــان بۆ بـــە دەســـتهێنانی مافەکانیان .

لە کۆتاییدا لەســـەر ئاســـتی وڵاتانی جیهـــان کۆنگرەیەکی گەورە لە باشـــووری ئەفریقیـــا لە شـــاری (دربان) لە ســـاڵی (٢٠٠١) بەســـترا بۆ ڕووبـــەڕوو بوونەوەی جیـــاکاری و پاکتاوی رەگـــەزی و بنەبڕ کردنی ئـــەم دیاردانە.



# ئاینی ئیسلام و جیاکاری و ڕەگەزپەرستی..

**چەمکی ڕەگەز پەرستی و جیاکاری لە ئیسلامدا و بانگەشەی یەکسانی لە نێوان مرۆڤەکاندا**

**چەند نمونەیەک لە جێبەجێ کردنی یەکسانی لە ئاینی ئیسلامدا**





منتدى إقرأ الثقافي

# چەمکی ڕەگەزپەرستی و جیاکاری لە ئیسلامدا و بانگەشەی یەکسانی لە نێوان مرۆڤەکاندا

ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە کاتێکدا هات ئەم سەر زەمینە پڕبوو لە نادادای و ستەمکاری، کەسانی بێ پشت و پەنا و لاواز دەچەوسێنرانەوەو بە هەموو شێوازێک مافەکانیان پێشێل دەکرا.

لێرەوە پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت) لە سەرەتای بانگەوازە پیرۆزەکەیەوە بانگەشەی بۆ دادپەروەری و یەکسانی دەکرد لە نێوان مرۆڤەکانداو هەموو جۆرە جیاکاری و ڕەگەز پەرستیەکی رەت دەکردەوە، ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی یەکتاپەرستی و یەک خودا ناسیە روحی ئیسلام هەموو جۆرە جیاکاریەک وەلا دەنێت . خوای گەورە دەفەرموێت **(إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ (سورة ص _ الآية ٧١ )**. واتە: من مرۆڤم لە قوڕ دروست کردووە ئەمەش واتای ئەوەیە کە ئەی مرۆڤەکان ئێوە هەر ڕەنگ و شێوەو باڵاو ڕەگەز و زمانێکتان هەبێت بیرتان نەچێت یەک بنەچەتان هەیە کە ئەویش دروست بوونە لە قوڕ بەڵێ لە قوڕ کەستان شانازیەکی زیاترتان بەسەر یەکەوە نیە!!

خوای گەورە ئەزمونی باوکە ئادەم (سەلامی خوای لەسەر بێت) زۆر بە ڕوونی لە قورئاندا بۆمان تۆمار دەکات، سەرەتا خوای گەورە ناوی هەموو دروست کراوەکان و زانیاری زۆری بەخشیە ئادەم پاشان لە لای فریشتەکان پرسیاری لێکردو ئەویش وەڵامی دایەوە، پاشان فریشتەکان بە فەرمانی خوای گەورە کڕنووشی ڕێزیان بۆ برد **(وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَٰؤُلَاءِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢) قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَائِهِمْ * فَلَمَّا أَنبَأَهُم بِأَسْمَائِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ (٣٣) (سورة البقرة)**.

(ئینجا ئادەمی دروســتکرد، ویســتی توانایی و لێهاتووی بۆ فریشــتەکان روون بکاتــەوە) ناوی هەرچــی پێویســتی دەوروبەر هەیــە فێری کرد، لــەوەودوا بە فریشــتەکانی ڕانوانــدو پێی فەرمــوون: ئادەی ئێــوە ناوی ئەو شــتانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاســت دەکەن و (توانای ئاوەدان کردنەوەی زەویتان هەیە؟). فریشــتەکان وتیان: پاکی و بێ گەردی و ســتایش هەر شایســتەی تۆیە ئێمە هیچ زانســتێکمان نیــە، تەنها ئەوە دەزانیــن کە تۆ فێرت کردووین، بە ڕاســتی تــۆ پەروەردگارێکی زانــاو دانایت. ئەوســا خوا فەرمــووی ئەی ئادەم، ئــادەی تۆ ئاگاداریــان بکە بە ناوەکانیــان، جــا کاتێک ئادەم هەواڵــی ناوەکانی پێدان: خوا فەرمــووی: ئەی پێم نەوتــن بە ڕاســتی خۆم ئاگادارم بــە نهێنی ئاســمانەکان و زەوی دەشــزانم ئێوە چی دەردەخەن و چی دەشــارنەوە؟) (تەفســیری ئاسان-لاپەرە٦).

ســەرەتا باوکە ئادەم ســەرکەوتوو بــوو لە پابەندبــوون بــە فەرمانی خوای گــەورە، بۆیــە خوای گەورە خســتیە بەهەشــت، پاشــان ئەزموونــی چوونە ناو بەهەشــت دێتە پێشــەوە، فەرمانی خــوای میهرەبانیان بۆ دێت کــە نابێت خۆت و هاوســەرت لــەو دارە بخــۆن.. بەڵام شــەیتان لە خشــتەیان دەبــات و، وایان تێدەگەیەنێــت کە ئەگــەر دەتانەوێت ببنە فریشــتەو بە هەتاهەتایــی بمێننەوە ئــەوا لــەو دارە بخۆن... لێــرەوە ململانێ لە نێــوان جێبەجێ نەکردنــی فەرمانی خوای گــەورەو ئــارەزووی بوون بە فریشــتەو مانــەوەی هەتاهەتایی دەســت پێــدەکات.. دواجار ئــارەزوو زاڵ دەبێــت و فەرمانی خوای گەورە دەشــکێنن.

خــوای گەورە دەفەرموێــت (**وَيَا آدَمُ اسْــكُنْ أَنْــتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّــةَ فَكُلَا مِنْ حَيْــثُ شِــئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّــجَرَةَ فَتَكُونَا مِــنَ الظَّالِمِينَ (١٩) فَوَسْــوَسَ لَهُمَا الشَّــيْطَانُ لِيُبْــدِيَ لَهُمَا مَــا وُورِيَ عَنْهُمَا مِنْ سَــوْآتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُــمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَــذِهِ الشَّــجَرَةِ إِلَّا أَنْ تَكُونَا مَلَكَــيْنِ أَوْ تَكُونَا مِــنَ الْخَالِدِينَ (٢٠) وَقَاسَــمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِــنَ النَّاصِحِينَ (٢١) فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّــجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَــوْآتُهُمَا وَطَفِقَــا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِــنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُــمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُــمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّــجَرَةِ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّــيْطَانَ لَكُــمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ (٢٢) (ســورة الأعراف).**

واتـــە (تۆش ئەی ئـــادەم خۆت و هاوســـەرەکەت لە بەهەشـــتدا نیشـــتەجێ بن جـــا لەهەر کـــوێ ئارەزوتان لێبـــوو (خوارەدەمەنی و میوەیە) بخـــۆن، (بەڵام) نزیکی ئەم درەختە مەکـــەون (درەختێکی تایبەتی بەردار بوو بـــۆ تاقیکردنەوەیان خـــوای گەورە بڕیـــاری دا کە هەر نزیکـــی نەکەون، چ جای لـــە بەروبومی بخۆن) ئـــەو کاتە دەچنـــە ریزی ســـتەمکارانەوە* شـــەتیان (ئەو ســـنورەی بـــۆ ئادەم و حەوا بە فرســـەت زانـــی)و ئینجا کەوتە فریدانی وەسوەســـە و خەتـــەرەو خەیاڵ بـــۆ نـــاو دڵ و دەروونیان، تا ئـــەو عەیب و عارەیـــان دەربخات کە شـــاراوە بوو لێیـــان، (دوای خۆی ئاشـــکرا کرد) و پێی وتـــن: پەروەردگارتان ئـــەم درەختەی لێ قەدەغـــە نەکردون تەنهـــا لەبەر ئەوەیە نەوەکو ببنە فریشـــتە، یاخـــود بۆ ئەوەیە نەوەکو لە نەمران بن!! * (ئەوســـا شـــەیتان زانی دەترســـن و دوو دڵن) ســـوێندی بـــۆ خواردن و کە من بە ڕاســـتی لـــە ئامۆژگارانم بـــۆ ئێوەوە دڵســـۆزتانم !!* ئیتر شـــەیتان بە فێڵ و پیـــلان فریـــودان (بـــەرەو لای درەختەکەی بـــردن) جا کاتێك تامی بەروبومـــی درەختەکەیان چەشـــت، هەرچی عەیب و عاریـــان هەیە کەوتە دەرەوە، (ناچـــار بە پەلە) دەســـتیان دایە گەڵای درەختەکانی بەهەشـــت عەیب و عـــاری خۆیان پێ دائەپۆشـــی و پەروەردگاریـــان بانگی کردن و فەرمـــوی: ئایا من قەدەغـــەی ئـــەو درەختەم لێ نەکـــردن و پێم نەوتن، کە بە ڕاســـتی شـــەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشـــکرایە؟!) (تەفسیری ئاســـان- لاپەرە ١٥٢)

ئـــەم هەڵوێســـتە ململانێیەکە لـــە دەروونـــی هەردوکیاندا (ئـــادەم و حەوا) (ســـەلامی خوایان لەســـە بێت) لە نێوان پشـــتگوێ خســـتنی فەرمانێکی ئاشکراو خواســـتە مرۆڤێتیەکەیاندا...

خوای گـــەورە لـــە ڕووی دەروونیەوە بە زانســـت ڕێزی لێنابـــوون و لە ڕووی مادییـــەوە بە بەهەشـــت پاداشـــتی کردبوون بـــەڵام ئەمان روانگـــەی دەروونیان بەرەو شـــتێکی تر جگە لـــە خواســـتە مرۆڤێتیە دەڕۆشـــت .. ئەمەیـــە ماهیەتی ڕەگەز پەرســـتی؟ مـــرۆڤ ناتوانێت نکۆڵی لـــە ماهیەتی مرۆڤ بوونـــی خۆی یان غەیـــری خۆی بـــکات و هەوڵ بدات شـــتێکی تـــر بێت .

منتدى إقرأ الثقافي

هەر زوو باوکە ئادەم و دایکە حەوا (سـەلامی خوایان لەسـەر بێت) چوونەوە نێـو ڕەزامەنـدی خوای گـەورەو دانیان نا بـە هەڵەکەیانداو پەشـیمان بوونەوە **(قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ . الأعراف_الآيـة ٢٣)**. واتـە: (وتیان پەروەردگارا ئێمە سـتەمان لـە خۆمان کرد خۆ ئەگەر لێـمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، ئەوە بەڕاسـتی سـوێند بە خوا لە خەسـارەتمەندو زەرەر مەندانین). (تەفسـیری ئاسـان لاپەرە- ١٥٣).

ئەمـە یەکـەم قوتابخانـەی مرۆڤایەتی بـوو کە هەڵـە کردن و پەشـیمان بوونـەوەی تیابوو **(وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ (١٢١) ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ (١٢٢) سـورة طـه**. واتە: ئـادەم یاخی بوو لـە پـەروەردگاری و فریوی خـواردو ڕێگای لێتێکچوو پاشـان پـەروەردگار هەڵی بژاردو کردی بـە پێغەمبەر تەوبـەی لێ وەرگرت هیدایەت و ڕێنمووی کرد. (تەفسـیری ئاسـان لاپەرە- ٣٢٠).

**(فَتَلَقَّىٰ آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (البقرة _الآية٣٧)**.

(پاشـان ئادەم لـە لایـەن پەروەردگاریەوە چەند وشـەو نزایەکـی وەرگرت (بـە دڵ و بە کـوڵ پاڕایەوە خـوای میهرەبانیـش) نزاکەی وەرگـرت و لێیخۆش بـوو، چونکە بە ڕاسـتی تەنها ئـەو، زاتێکی ئێجـگار میهرەبان و تۆبـە وەرگرە). (تەفسـیری ئاسـان- لاپەرە ٦).

بیـرو بـاوەڕی یەکتاپەرسـتی لە ئیسـلامدا کرۆکی ئـەم ئاینەیـە، هاوکات دادپەروەری نێـوان مرۆڤەکان خـوای گـەورە دەفەرموێت:**(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا. (النسـاء _الآية١)** .

واتـە (ئەی خەڵکینە لە خەشـم و ناڕەزیەتی ئـەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسـێک دروسـت کردووە، هەر لەو نەفسـەش هاوسەرەکەی بەدیهێناو لـەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خسـتۆتەوەو بڵاوکـردەوە، هەروەها

لـــەو خوایە بترســـن کـــە لەیەکـــتر داوا دەکـــەن بـــە ناوهێنانی ئـــەوەوە، هەوڵ بـــدەن پەیوەندی خزمایەتیـــش بپارێزن و (پتـــەوی بکەن) چونکە بەڕاســـتی خوا (هەمیشـــەو بەردەوام) چاودێرە بەســـەرتانەوە. (تەفسیری ئاســـان لاپەرە ٧٧).

مرۆڤـــەکان جیاوازیـــان لەگـــەڵ یەکتردا نیـــە با لـــە وڵاتی دوور لـــە یەکترو جیـــاوازدا بژین، یان زمـــان و ڕەنگی جۆراوجۆریـــان هەبێت یان بـــاری ئابوری و کۆمەڵایەتـــی وەک یەکمان نەبێت هەموومـــان فەرمانمان پێکراوە لە خوا بترســـین و بـــرای یـــەک بین، ئێمە وەکـــو کۆمەڵگـــەی مرۆڤایەتی ئەم ســـەردەمە ئامادەی دروســـت بوونی ســـەرەتای مـــرۆڤ نەبووین، لـــەو کاتەدا یـــەک کۆمەڵگەو یەک زمانی هاوبـــەش هەبوو لـــە نێوانیاندا، بەڵکو قـــەدەری ئێمە وایـــە زمانی جۆراو جـــۆرو ڕەنگی جیاواز لـــە نێوان مرۆڤـــەکان ببینیـــن بێگومان ئەمـــش لە مەزنی خوای بەدهێنەرە. خوای گـــەورە دەفەرموێت **(وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّـــمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِـــنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُـــمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِـــينَ .(الروم _الأية٢٢).**

واتـــە: (یەکێکـــی تر لە نیشـــانەو بەڵگەکانی خـــوای میهرەبان دروســـتکردنی ئاســـمانەکان و زەویـــە (کـــە زاناکانـــی ئەستێرەناســـی لە ئاســـتیدا سەرســـام و ســـەرگەردانن) و جیـــاوازی زمـــان و ڕەنگتانـــە (دەنگی هیچ کەس لە کەســـی تر ناکات)، ســـەرەرای ســـەدەها جـــۆر زمان، کە جۆری قســـەکردن و دارشـــتنی هەر گەلێـــک تایبەتمەنـــدی خـــۆی هەیە، جگە لـــە هەزاران شـــێوەزار کە لـــەو زمانە ســـەرکیانە دەبێتەوە) بە ڕاســـتی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشـــانەی زۆر هەیە بۆ زانایان و شـــارەزایان.) (تەفســـیری ئاســـان لاپەرە- ٤٠٦).

فەرمایشـــتەکانی خوای گەورە ســـەبارەت بە جیاوازی ڕەنگـــەکان و زمانەکان لە مرۆڤەکاندا، هاوکاتە بـــە جۆراو جۆریەتی چینەکانـــی زەوی و میوەی هەمەجۆر و ژینگەی جۆراو جـــۆر و هەمەجۆری لـــە ئاژەڵەکانداو، زۆر بابەتـــی تر کە جێگەی تێڕامان و هەڵوەســـتە لەســـەر کردنـــن، لێـــرەوە هەمەڕەنگی و فرە چەشـــنی و جۆراوجۆریەتـــی جوانی دەبەخشـــێت بە ژیان و تابلۆکـــە تەواو دەکات.

خـــوای میهرەبـــان دەفەرموێت:**(أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّـــمَاءِ مَـــاءً فَأَخْرَجْنَا**

**بِـــهِ ثَمَـــرَاتٍ مُخْتَلِفًـــا أَلْوَانُهَا وَمِـــنَ الْجِبَالِ جُـــدَدٌ بِيضٌ وَحُمْـــرٌ مُخْتَلِـــفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيـــبُ سُـــودٌ (٢٧) وَمِنَ النَّاس وَالـــدَّوَابِّ وَالْأَنْعَـــامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُـــهُ كَذَٰلِكَ إِنَّمَا يَخْـــشَى اللَّهَ مِـــنْ عِبَادِهِ الْعُلَـــمَاءُ إِنَّ اللَّـــهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ (٢٨) ســـورة فاطر.**

واته (ئايا ســـەرنجت نەداوە کە بەڕاســـتی خوا لە ئاســـمانەوە بارانی باراندوە، جا ئێمـــە بـــەو بارانە جۆرەهـــا بەروبومـــی جیاوازمـــان دەرهێنا کـــە (ڕەنگیان، قەبارەیـــان، تامیان، بۆنیان و شـــێوەیان، شـــوێنیان، وەرزیان) جیـــاوازە، هەروەها هەندێـــک لە کـــەژو کێوەکانمـــان بە زنجیـــرە کێشـــاوە، هەیانە چیـــن و هێڵ و نەخشـــی ســـپی و ســـورەو ئەوانیش ڕەنگیان جیاوازە، هەشـــیانە رەنگی رەشێکی تاریـــک و تۆخە* هەروەها بەو شـــێوەیە لـــە خەڵکیش، لە گیانـــداران و ماڵاتیش، جۆرەهـــا ڕەنگ و شـــێوەو قەبـــارەی جیاواز هەیە، بە ڕاســـتی هـــەر زاناکان پەی بـــەو نهێنیانە دەبـــەن و لە نـــاو بەندەکانی خوادا هـــەر ئەوان لە خوا دەترســـن (لە ســـەردەی عیلم و زانســـتدا ئەم ڕاســـتیە روونە چونکە زاناو پســـپۆڕان کاتێک وردەکاری بەدیهێنـــراوان پەی پێ دەبەن، زۆر هەســـت بە گەورەیی و دەســـەڵاتی خوا دەکەن) بە ڕاســـتی ئەو خوایە زۆر باڵادەســـتە و، زۆریش لێخۆشـــبووە (کاتێک رووی تێدەکـــەن و باوەڕی پێدەهێنن). (تەفســـیری ئاســـان لاپەرە- ٤٣٧).

پێغەمبـــەر (دروودی خـــوای لەســـەربێت) دەفەرموێـــت (أنا ســـابق العرب و صهيب ســـابق الروم، و ســـلمان ســـابق الفرس، و بلال ســـابق الحبـــش) (أخرجه الحاكـــم في المســـتدرك) واتە (من پێشـــڕەوی عەرەب بـــووم لە هاتنـــە ناو ئاین پیرۆزی ئیســـلامدا و ســـوهەیب پێشـــڕەو بوو لە ناو ڕۆمەکاندا و ســـەلمان لە ناو فارســـەکاندا، و بیلال لە ناو حەبەشـــیەکاندا).

روونە کە چـــۆن پێغەمبەر لەگەڵ خۆیدا بە یەک ئاســـت باســـی باوەڕهێنانیان دەکات، خـــۆی فەزڵـــی نەداوە بەســـەر ئەواندا، لـــە کاتێکداو لەو ســـاتەوەختەدا ئاوەها برایەتیەکا ئاســـان نەبوو.

وێنایەکـــی تر بـــۆ جەخت کردنەوە لەســـەر برایەتـــی دەبینین خـــوای گەورە لە قورئانـــدا فەرمان بە بـــاوەڕداران دەکات کـــەوا باوەڕ بە ســـەرجەم پێغەمبەران

(ســەلامی خوایان لێبێت) بهێنــن وە جیاوازیش نەکەن لــە نێوانیاندا خوای گەورە دەفەرموێــت: (**قُولُوا آمَنَّا بِاللَّــهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَــا وَمَا أُنزِلَ إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْــمَاعِيلَ وَإِسْــحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْــبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَــا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَــيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْــلِمُونَ (البقــرة _ الآية ١٣٦).**

واتــە (ئەی پەیڕەوانی محمــد (درودی خوای لێبێت) ئێوە بڵێــن ئێمە باوەڕمان بە خــوا هێناوەو بــەو قورئانەش کــە دابەزیوە بۆمــان و بەوەش کــە دابەزیوە بــۆ ئیبراهیم و ئیســماعیل و یەعقــوب و نەوەاکانــی یەعقــوب، هەروەها بەو پەیامەی کە بۆ موســاوُ عیســا هاتــووەو بەو پەیامانــەی کە بــۆ پێغەمبەران بە گشــتی ڕەوانە کراوە لــە لایــەن پەروەردگاریانــەوەو ئێمە جیــاوازی ناکەین لە نێوان هیچــکام لــەو پێغەمبەرانەدا، ئێمــە هەموومان تەنها تەســلیمی فەرمانی پەروەردگارین). (تەفســیری ئاســان- لاپەرە ٢١).

هەروەهــا پێغەمبــەر (د.خ) لە یەکێک لــە فەرمودەکانیدا هەوڵ و تێکۆشــانی ســەرجەم پێغەمبەران بۆ یەک ئامانج و مەبەســت بەرز دەنرخێنێت و دەفەرموێت **(ان مثــلي و مثــل الأنبياء من قبــلي كمثل رجل بنــى بيتا فأحســنه و أجمله، الا موضــع لبنة في زاويــةو فجعل الناس يطوفون به و يجعلــون و يقولون: هلا وضعت هــذه اللبنة ؟ فأنا اللبنــة و أنا خاتم النبــين) متفق عليه ورواية أحمد في المســند.**

واتە (وێنەی ئــەم کارەی من و کاری ســەرجەم پێغەمبــەران، وەک ئەوە وایە کــە کەســێک خانوویەکــی جوانی دروســت کردبێــت و تەنها لە ســوچێکەوە شــوێن خشــتێکی نوقوســتان بێت، لە کاتێکدا خەڵکی بە دەوری ئــەم خانوەدا دەســوڕێنەوەو پێی سەرســام دەبــن و دەڵێن خۆزگە شــوێنی ئەو خشتەشــی نوقوســتان نەبووایە و دابنرایە، وەمن ئەو خشتەم و کۆتای پێغەمبەرانم. پێغەمبەر (درودی خــوای لەســەربێت) هەرگیــز خــۆی بە گەورەتــر لــە پێغەمبەرانی تر دانەناوە و زۆر بە ڕێزەوە باســی کردون، بۆ نمونە ســەبارەت بە یوســف (سەلامی خوای لەســەر بێت) دەفەرمــوێ **(أ تدرون مــن الكريم ابن الكريــم إبن الكريم إبن الكريم؟** إنه **يوســف بــن يعقوب بن إســحاق بن إبراهيــم) (رواه بخاري و**

**أحمد)**، واته (دەزانن بەخشـــندەی کوڕی بەخشـــندەی کوڕی بەخشـــندەی کوڕی بەخشـــندە کێیە؟ یوســـفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیســـحاقی کـــوڕی ئیبراهیم)ە .

ســـەبارەت بە موســـا (ســـەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێت **(رحم الله موســـى أوذي بأكـــثر من هذا فصـــبر) (متفق عليـــه)**، واته (ســـۆزو بەزەیی خـــوا بڕژێت بەســـەر موســـادا زیاتر لە ئێمـــە ئـــازار درا و ئارامی گرت).

ســـەبارەت بە عیســـا (ســـەلامی خوای لێبێـــت) دەفەرموێت **(أنـــا أولى الناس بعيـــسى ابـــن مريـــم والأنبيـــاء** أولاد **علات ليـــس بينـــي و بينه نبـــي) (متفق عليـــه)**، واته (من لە پێشـــترم لـــە هەموو کەس بە عیســـای کـــوڕی مەریەمەوە، پێغەمبـــەران وەکو کوڕی یـــەک باوک وان دایکیـــان جیا بێت، وە لـــە نێوان من و ئـــەودا پێغەمبەر نـــە هاتووە.)

پێغەمبـــەر (درودی خـــوای لەســـەربێت): **بعثـــت إلى الناس كافـــة الأحمر و الأســـود) رواه أحمد في المســـند.** واته من بۆ ســـەرجەم مرۆڤایەتی نێردراوم، (سور پێســـت و ڕەش پێست).

هەروەهـــا ئاینی پیرۆزی ئیســـلام لـــە ســـەرجەم پەرســـتن و بەندایەتیەکاندا داپەروەری و یەکســـانی تێدایە لە نێوان ســـەرجەم مرۆڤەکانـــدا، نوێژ (٥) فەرزەو بە یەکســـانی هەر دوو ڕەگـــەز دەبێت ئەنجامی بـــدەن، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بە هەمان شـــێوەیە، هەروەها مەراســـیمی ئەنجامدانی حەج هەموو بە یەکســـانی دروشـــمەکان ئەنجام دەدەن و یەک پۆشـــاکیان لەبەردایە .

هەروەهـــا لە کاتـــی دروســـتکردنی خێزان و بە شـــوودانی کـــچ و ژنهێنان بۆ کوڕانـــدا، دەفەرموێ **(إذا جاكم مـــن ترضون دينه و خلقه فزوجـــوه)** واته (ئەوەی کە هاتـــە داوای کچتان لـــە ئاین و ڕەوشـــتی ڕازی بوون، ئێـــوەش ڕازی بن و ئەو خزمایەتیـــە بکەن) .. لێرەوە دەبینین، نەباســـی بنەماڵەو نە ڕەنـــگ و نە زمان و نە هـــەژاری و نـــە دەوڵەمەندی نەکردووەتە مـــەرج و پێوەر بەڵکو باوەڕو ڕەوشـــت جوانـــی کردوەتە مەرج.

هـــاوکات لە کاتـــی دادگایی کردنـــدا چەندین نمونەی بەرزو جـــوان لە مێژووی

ئیسـلامدا تۆمار کـراوە، کاتێک ئافرەتێکـی مەخزومی دزی کـردو خەڵکێکی زۆر هاتنــە لای پێغەمبــەر (درودی خوای لەســەربێت) بۆ تکا کردن بۆ ســوک کردنی حوکمەکــەی چونکە لــە خانەدانەکانــی هۆزەکانی عەرەب بوو، بــەڵام پێغەمبەر فەرمایشــتە بــە ناوبانگەکــەی فەرمــوو (والله لــو فاطمة بنــت محمد سرقت لقطعــت يدها) رواه البخاري، واتە (ســوێند بــە خوا ئەگەر فاتیمــەی کچم دزی بکات دەســتی دەبڕم).

زۆر نمونــەی بــەرزو جــوان لــە مێــژووی فەرمانڕەوایەتی و ژیانــی کرداری مســوڵماناندا تۆمار کــراوە، دادگاو دادپەروەری دادگاکانیشــی وێنەیەکی جوانیان نیشان داوە.



# خانەوادە شانشینەکان
# کە فەرمانڕەوایەتی دەکەن

- سیستمی پاشایەتی یەکێکە لەو سیستمە ڕامیارییەی کە تا ئێستا لە جیهاندا ماوە.
- گرنگترین ئەو خێزانە پاشایەتیانەی کە لە هەندێک وڵاتانی جیهاندا هەن.
- بنەماڵەی بۆش گرنگترین ئەو خانەوادانەی کە فەرمانڕەوایەتی وڵاتی ئەمریکایان کردوە لەم چاخە نوێیەدا.
- گرنگترین ئەو خێزان و بنەماڵانەی کە فەرمانڕەوایەتیان کردوەو باڵادەست بوون لە سەردەمی نوێدا (یەکێتی پارەو دەسەڵات).




منتدى إقرأ الثقافي

# سیستمی پاشایەتی یەکێکە لەو سیستمە سیاسیەی کە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ ماوە

جیهـــان هەر لە کۆنەوە ئەم جـــۆرە فەرمانڕەوایەتیەی ناســـیوە، بێگومان ئەمەش لــــە بەڕێوەبردنی هۆز و بنەماڵەکانەوە دەســـتی پێکردووە لە لایـــەن بنەماڵەیەکەوە کـــە خۆیان بە جیاوازتر و شـــیاوتر زانیوە لە کەســـانی تری هـــۆزو بنەماڵەکە، وە بە بەردەوامی پارێزگاریان لە بنەچەو پشـــت و خوێنـــی خۆیان کردووە.

بە پاســـاوی خوێنپاکـــی و ڕەچەڵەک و بنەماڵـــە فەرمانڕەوایەتیـــان کردووەو تا ئێســـتاش لە زۆرێک لە وڵاتانی جیهـــان ئەم جۆرە فەرمانڕەوایتیـــە ماوە، ئەگەرچی کەمێـــک جیـــاوازی روکەشـــیان لە خۆیاندا دروســـت کـــردوە لەگەڵ سیســـتمی پاشایەتی کۆندا.

ئەو وڵاتانەی کە تا ئێستا بە سیستەمی پاشایەتی فەرمانڕەوایەتی دەکەن

**١- کیشوەری ئەوروپا:**

ئیسپانیا، بەلجیکا، دانیمارک، سوید، بەریتانیا، مۆناکۆ، نەرویج، هۆڵەندا.

**٢- کیشوەری ئاسیا:**

ئوردن، سعودیە، عومان، مالیزیا، بڕۆنای، تایلەند، نیپاڵ، یابان .

**٣- کیشوەری ئەفریقیا:**

سوازیلاند، مەغریب.

ئەم خانـــەوادە فەرمانڕەوایانـــە پێکدێن لە خێزانە پاشـــایەتیەکان واتە پاشـــاو شـــاژن و ئیمپراتۆر و ســـوڵتانەکان، خێزانە فەرمانڕەواکان پێکدێن لە پاشـــای وڵات و خێـــزان و کـــوڕو کچەکانی و ژنـــی کوڕەکانـــی و وەچەکانی، زۆربـــەی یاخود هەموو پلە و پۆســـتە هەســـتیارو باڵاکانی وڵات لە نێوان خۆیانـــدا دابەش دەکەن، لـــە هەندێ وڵاتیش پاشـــا یان شـــاژن بە ڕەســـمی ســـەرۆکی وڵاتـــەو کۆمەڵێک دەســـەڵاتی شـــاهانەی تەشریفاتـــی هەیە، بەڵام بەشـــداری لە هیـــچ چالاکیەکی حکومەتـــدا ناکات واتـــە (ئەنجومەنی وەزیـــران) نمونە وڵاتـــی بەریتانیا.

لێـــرەوە بـــە درێژایـــی مێـــژوو لـــە کۆمەڵگـــە بچـــووک و گەورەکانـــدا هەڵبـــژاردن کراوە بـــۆ دیاریکردنی ســـەرۆک هـــۆزو عەشـــیرەت و وڵاتەکان بـــۆ فەرمانڕەوایەتی و بەڕێوەبـــردن هەر کەســـێکیش دەرچووبێت دوای خۆی دەســـەڵات و فەرمانڕەوایەتیەکـــەی داوە بـــە کوڕەکەی یان براکـــەی (بێگومان بـــە زۆری دراوە بە کـــوڕی فەرمانـــڕەوا). لە مێـــژووی کۆنـــدا فیرعەونەکانی میـــسر کۆنترین بنەماڵـــەی فەرمانڕەوا بوون، کە توانیویانە(ســـی پاشـــا)یەک لە دوای یەک و پشـــتاو پشـــت فەرمانڕەوایەتـــی وڵاتەکە بکەن بـــە گوێرەی داب و نەریتـــی خۆیـــان هەتاوەکو (ئەســـکەندەری گەورە) ئەم وڵاتـــەی داگیرکردو لە ســـەدەی چوارەمی پێـــش زاینیدا کۆتایی بـــە دەســـەڵات و فەرمانڕەوایەتی فیرعەونـــەکان هێنا.

خانەوادە پاشاکان دوو جۆر فەرمانڕەوایەتیان هەبووە:

١- پاشایەتی دەستوری .

٢- پاشایەتی ئاینی پیرۆز .

١- پاشـــایەتی دەســـتوری: پاشـــا دەســـتوریەکان ئەو شانشـــینانەن کـــەوا لە دەســـتوری وڵاتەکەدا هەندێ دەســـەڵاتی تەشریفاتی ســـنورداری بۆ دیاریکراوەو ڕەمزیـــە، نمونە پێشـــوازی لە ســـەرۆکی وڵاتـــان، ئامادەبوون و وتـــار خوێندن لە بۆنـــەکان ...، لـــە ئێســـتادا زۆربەی وڵاتـــە شانشـــینەکان لەم جۆرەن و پاشـــاکان بەشـــدارنین لـــە بەڕێوەبردنی حکومەتـــدا، لەو وڵاتانـــەش (بەلجیـــکا، هۆڵەندا، مالیزیا، میرنشـــینە یەکگرتوودکانـــی بەریتانیا) .

٢- پاشـــایەتی ئاینی پیـــرۆز: ئەم جـــۆرە تاڕادەیـــەک لـــەم ڕۆژگارەدا نەماوە ئـــەوەش بەم شـــێوەیە بووە هەموو دەســـەڵاتەکان لە لای کەســـی یەکـــەم بووە، وە بڕیارەکانـــی بە پیرۆز ســـەیر دەکرا هیچ کەســـێک بۆی نەبووە لـــە بڕیارەکانی لابـــدات وەک ئـــەوە وابـــووە کە هـــەم ئاینی پێشـــێل کـــردوە هەم لە یاســـاش دەرچـــووە. بـــە کورتی ئەم جۆرە لە پاشـــایەتی خۆیـــان بە نوێنەری خـــودا زانیوە لەسەر زەوی.

**بە ناوبانگترین بنەماڵە فەرمانڕەواکان لە جیهاندا ئەمانەن:**

| وڵات | بنەماڵەی فەرمانڕەوا | پاشای ئێستا یان شاژنی ئێستا |
|---|---|---|
| بەلجیکا | ساکس کوبیرج جوتا | ١٨٣١ز ئەلبێرتی دووەم |
| بوتان | وانغ تشوک ١٩٠٧ | جیغما سینکی وانغ تشوک |
| بروناى | بلقيه | حسن البلقيه |
| دەنیمارک | لە سەدەی دەوە | مارگریت (شاژن) |
| یابان | لە سەدەی حەوتەوە | ئەکیهیتو (ئیمپراتۆر) |
| ئوردن | الهاشميه ١٩٤٦ ز | عەبدوڵای کوڕی حوسەین |
| لختشتاین | لختشتاین ١٨٠٦ ز | شازادە هانزادم |
| لوکسەمبۆرگ | ناساو ١٨٩٠ ز | ئەلگراند دۆق جین |
| مالیزیا | نیریت | سوڵتان توانکۆ جەعفەر |
| مۆناکۆ | گریماڵدی ١٢٩٧ ز | شازادە ڕینیە سێیەم |
| مەغریب | عەلەوی سەدەی حەڤدە | محەمەدی شەشەم |
| نیپاڵ | ١٧٦٦ ز | بیرندرا |
| هۆڵەندا | ئۆرانج ١٥٤٤ ز | بیاتریس (شاژن) |
| نەرویج | ١٩٠٥ ز | هارالد |
| عومان | بنەماڵەی تورکی سەعید | سوڵتان قابوس کوڕی سەعید |
| سعودیە | بنەماڵەی سعود | پاشا سەلمان |
| ئیسپانیا | بوربون ١٧٠١ ز | — |
| سوید | برنادوت ١٨١٨ ز | کارلی شانزەیەم جوستاف |
| تایلەند | تشاکری ١٧٨٢ م | بەهومیبول |
| تونجا | تاتوفا ئەهوا ١٨٤٥ ز | تۆبۆی چوارەم |
| بەریتانیا | وندسور | ١٩١٧ز ئەلیزابیثی دووەم (شاژن) |
| ساموا | — | مایتوا تانوما فیلی دووەم |

منتدى إقرأ الثقافي

## بنەماڵە فەرمانڕەواکانی جیهان لە ئێستادا

ئـــەم جیهانەی کـــە تێیدا دەژین لە کـــۆن و نوێدا لەلایـــەن کۆمەڵێک بنەماڵەو خانەوادەی دەســـت ڕۆیشتووەوە لە ڕووی دارایی و ســـەربازیەوە بەڕێوەبراوە، ئەم فەرمانڕەوایەتی پاشـــایەتیە لـــە جیهانداو لە وڵاتـــە جۆراوجۆرەکانـــدا بە هەردوو شـــێوازەکە واتە شـــێوازی باش و شـــێوازی خراپ فەرمانڕەوایەتیان کردوە، مێژووی هەر وڵاتێک تەماشـــا بکەین کـــە وڵات بەڕێوەبردنەکەی پاشـــایەتی بێت کۆمەڵێک پاشـــای داپەروەر و مرۆڤدۆســـتی تیابووە، وە بە هەمان شـــێوە کۆمەڵێ پاشـــای نا دادپەروەر و خوێنرێژو ســـتەمکاری تیابووە کە تەنها مەبەســـتی پاراســـتنی کورسی دەسەڵاتەکەی بووە.

لێـــرەوە چەند نمونەیەکی بنەماڵـــە فەرمانڕەواکان لە جیهانـــدا باس دەکەین بە گوێرەی هەر سێ کیشـــوەرە مەزنەکە:

**یەکـــەم/ کیشـــوەری ئەوروپـــا:** مێژووی هەنـــدێ لە پاشـــا فەرمانـــڕەواکان دەگەڕێتەوە بۆ ســـەدەکانی ناوەڕاســـت، هۆکاری چوونە ســـەر کورسی دەسەڵات لە لایەن هەندێ لـــە بنەماڵەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری سیاســـی و داگیرکاری نمونەش پاشـــای وڵاتی ســـوید (بابتـــس برنـــادوت) ســـاڵانی (١٧٦٣ - ١٨٤٤) ز . ئەفســـەرێکی فەڕەنســـی بوو ناپلیۆن کردی بە پاشـــای ســـوید و دواتر پەرلەمانی ئـــەو وڵاتەش دانیـــان پێداناو ناویـــان نا چارلـــزی چواردەیەم.

هۆکاری ژن و ژنخوازیـــش یەکێکی تر بووە لەو هۆکارانـــەی کەوا بنەماڵەیەکی کردوە بە فەرمانڕەوا.

وڵاتی ئیســـپانیا: شـــاژنەکەیان کچی پاشـــا پۆلی یۆنانیە لەگەڵ (خوان کارلۆس) خێزانیان دروســـت کرد و ســـێ کوڕیان بوو کە دواتر فیلیپ بووە شـــای ئیســـپانیا. هەروەها شـــازادە (فیلیـــپ دۆقی ئەدنبەر)ەیە هاوســـەری شـــاژنە (ئەلیزابێث ی دووەم).

شـــاژنی میرنشـــینە یەکگرتووەکانـــی بەریتانیـــا، بنەچـــەی دەچێتەوە ســـەر خانـــەوادی پاشـــایەتی دانیمارک.


منتدى إقرأ الثقافي

وڵاتـــی ئیســـپانیا لەســـەرەتاوە هـــەر پاشـــایەتی بـــووە، بەڵام بـــۆ ماوەیەک جەنـــەڕاڵ (فرانکۆ) پاشـــایەتی نەهێشـــتووە، بەڵام لە ســـاڵی (١٩٣٨) دوای مردنی ئـــەم جەنەڕاڵـــە جارێکی تر (خـــوان کارلـــۆس) بووەوە بە پاشـــای ئـــەم وڵاتە.

وڵاتی بەلجیکا: (لیو بۆڵد ســـاکس کوبیرچ) دوای بە دەســـتهێنانی سەربەخۆیی ئـــەم وڵاتە لـــە هۆڵەندا ســـاڵی (١٨٣١)ز بـــوو بە یەکەم پاشـــای ئـــەم وڵاتەو تا ئێســـتایش حوکمڕانیەکەیان پاشایەتیە ..

وڵاتی نەوریج: دوای بە دەستهێنانی ســـەربەخۆیی لە ساڵی (١٩٠٥)ز پەرلەمانی ئـــەو وڵاتە رازی بـــوون بە دیاریکردنی شـــازادە (کارل)ی دەنیمارکـــی کە ببێت بە پاشـــای وڵاتەکەیان، بەڵام پاشـــای ئێســـتایان کە لە ســـاڵی (١٩٢٧)ز لـــە دایکبووە یەکەم پاشـــای بنەچە نەرویجـــی وڵاتی خۆیانە..

وڵاتـــی هۆڵەندا: یەکێکـــە لەو وڵاتانەی کە لـــە دێر زەمانەوە پاشـــایەتی بووە، بنەماڵـــەی (ئۆرانج ناســـاو) لە (١٥٧٢ - ١٥٨٤)ز پاشـــا (ولیەم) بـــە دامەزرێنەری وڵاتی هۆڵەنـــدا دادەنرێت..

ئەمانـــە نمونەی چەند وڵاتێکی ئەوروپی بوون کە سیســـتەمی فەرمانڕەوایەتیان پاشایەتیە.

**دووەم / کیشـــوەری ئاســـیا:** وڵاتـــی چین و هینـــد دوو وڵاتی هـــەرە چڕن لە ڕووی دانیشـــتوانەوە تا ئەم ســـاڵانەی دوایـــی فەرمانڕەوایەتی تیایاندا پاشـــایەتی بووە.

دوا بنەماڵـــەی پاشـــایەتی لـــە وڵاتی چین بنەماڵەی (مانشـــو) بووە لە ســـاڵی (١٩١٢)ز بوو بـــە کۆماری..

- وڵاتـــی هینـــد فەرمانڕەوایەتـــی پاشـــایەتی بـــووە، وە پێکهاتـــووە لە چەند هەرێمێکی جیـــاوازو پاشـــاکانیان زۆر دەوڵەمەند بوون تا ســـەدەی نۆزدە کە لەو بەروارەوە کەوتنە ژێر دەســـەڵاتی بەریتانیا .. تا بەدەســـتهێنانی ســـەربەخۆیی لە ســـاڵی (١٩٤٧)ز بەم شـــێوەیە بـــووە، دواتر وڵاتـــی هیند بوو بە کۆمـــاری و ئەم هەرێمانـــە چوونە ژێـــر فەرمانڕەوایەتی کۆماری هیندســـتانەوە.

- وڵاتی برۆنای پاشـــایەتیەو ڕەگ و ریشـــەی پاشـــایەتی تیایدا دەگەڕێتەوە بۆ سـەدەی پانزەی زاینی بۆ فەرمانڕەوایەتی پاشـا مسـولمانەکان ..

ئێسـتا پاشـاکەیان ناوی (مودا حەسـەن بەلقیە)لە سـاڵی (١٩٦٧)ز ەوە لەسە کورسـی دەسـەڵاتەو بە تەنهـا خۆی سـەرۆک وەزیـران و وەزیـری بەرگریە، دەوترێت سـێیەم دەوڵەمەنـدی جیهانە..

- وڵاتـی تایلەنـد پاشـایەتیە، بنەماڵەی (تشـاکری) لە سـاڵی (١٧٨٢)ز ەوە تایلەند بەڕێوە دەبەن، سـاڵی (١٩٣٢) پاشـا (ڕاما)ی حەوتەم کردی بە پاشـایەتی دەستوری.

- وڵاتی ئوردن پاشـایەتیە پاشـا (حوسـێن) لە سـاڵی (١٩٥٢)ز لەسەر تەختی پاشـایەتی دانیشـت تا کاتی مردنی لە سـاڵی (١٩٩٩)، لە دوای مردنی خۆی پاشا (عەبدوڵا)ی کوڕی کرد بە پاشـا ..

- وڵاتـی عومـان فەرمانڕەوایەتی تێیدا پاشـایەتییە دەگەڕێتـەوە بۆ هەردوو هـۆزی (ئـەزد و یەعروب) کـە لە سـاڵی (١٠٠)ی پێـش زاینەوە لـەم ناچەیە جێگیر بوون، یەکێک لە باوباپیرانی سـوڵتانی ئێسـتا (سـوڵتان قابوس) وڵاتەکەی لە چنگی فارسـەکان رزگار کرد لە سـەدەی هـەژدەی زاینی و میرنشـینی (ئیبن سـەعید)ی دروستکرد، لە سـالی (١٩٣٢) سـەعید باوکی سوڵتانی ئێسـتا بوو بە پاشـای وڵات، پاشـان سـاڵی (١٩٧٠) کوڕە تاقانەکەی کە سـوڵتان (قابوس)ە بوو بە سـوڵتانی وڵاتی عومـان و لە سـاڵی (٢٠١٩)ز کۆچـی دوایی کرد.

- وڵاتـی سـعودیە بـە هەمـان شـێوە سیسـتمی فەرمانڕەوایەتـی تیایدا پاشـایەتیەو، لە ناوەڕاسـتی سـەدەی پانزەیەمینی زاینیەوە ناوی ئـەم بنەماڵەیە هاتووە، ئێسـتاش پاشا (سـەلمانی کوڕی عەبدولعەزیز) پاشـای وڵاتەو کوڕەکەشی جێنشـینی باوکیەتی و سـەرۆک وەزیرانیشە.

- وڵاتی یابان پاشـایەتیەو هاونیشـتیمانیان زۆر بە پیرۆز تەماشـای بنەماڵەی پاشـایەتی دەکەن، پاشـاو فەرمانڕەواکانیان بـە ڕەهایی وڵاتیـان بەڕێوەدەبرد، تا سـاڵی (١٩٤٧)ز دوای شکسـت و دۆڕانی وڵاتی یابان لە جەنگـی جیهانی دووەم،


منتدى إقرأ الثقافي

لەم بـــەرووارەوە فەرمانڕەوایەتی بوو بە پاشـــایەتی دەســـتوری و گۆڕانکاری ڕویدا.

- وڵاتـــی مالیزیـــا جۆرێکی تایبـــەت لـــە فەرمانڕەوایەتـــی پاشـــایەتی تیایدا بەرقـــەرارە، وڵات لە لایەن نـــۆ بنەماڵەوە بەڕێـــوە دەبرێت و هـــەر بنەماڵەیەک بـــە هەڵبژاردن لە نێـــوان خۆیانـــدا یەکێک هەڵدەبژێـــرن و بۆ ماوی پێنج ســـاڵ دەبێت بە پاشـــای وڵات.

- ســـوڵتان (ئـــەزلان موحب الدین پاشـــا) کـــە فەرمانڕەوای هەرێمـــی (بیراق) بـــوو (خانەوادەکەیان لە ســـەدەکانی ناوەڕاســـتەوە ئەم هەرێمـــە بەڕێوەدەبن)، لە ســـاڵی (١٩٨٩) بـــوو بە پاشـــای وڵات بۆ ماوەی پێنج ســـاڵ . دواتر لە ســـاڵی (١٩٩٤)ەوە ســـوڵتان (توانکو جەعفەر) بۆ ماوەی پێنج ســـاڵ بوو بە پاشـــای وڵات.

- یەکێکـــی تر لـــەو وڵاتانەی کە دەکەوێتـــە ناو هەر دوو کیشـــوەری ئەوروپاو ئاســـیاوە وڵاتـــی تورکیایە، ئـــەم وڵاتە بۆ ماوەی شـــەش ســـەدە واتە لە ســـاڵی (١٢٨٠- ١٩٢٢) ز لە لایەن بنەماڵەی (ئال عوســـمان)ەوە بە شـــێوەیەکی پاشایەتی و پشتاوپشـــت فەرمانڕەوایەتی کـــراوە، دەوڵەتێکیان بە ناوی خەلافەتی ئیســـلامیەوە بنیات ناوەو توانیویانە لـــەو ماوە دورو درێـــژەی فەرمانڕەوایەتیاندا زۆرێک ناوچە بخەنە ژێـــر ڕکێفـــی قەڵەمڕەویەکەیانەوە و ســـنوری وڵاتەکەیان تـــا ناوجەرگەی ئەروپـــا ببـــەن و ناوچەکانی (بەڵقـــان و مەجـــەڕ) داگیر بکەن، هەمـــوو دەریای ســـپی ناوەڕاســـت لە ژێر هەژمونی کەشـــتی گەلی دەریای ئەواندا بـــووە، لە ســـەردەمی (سەلیم)ی ســـێیەمدا (١٥٢٠- ١٥٦٦)ز ئەم کەشـــتی گەلە گەیشتووەتە لوتکـــەی بەهێـــزی توانیویەتی بەرامبـــەر هەموو هێـــزە دەریاییەکانـــی وڵاتانی ئەوروپا بوەســـتێتەوە، هەر بە هـــۆی ئەم هێـــزە دەریاییـــەوە توانیویانە وڵاتانی (میسرو ســـودان و لیبیا و جەزائیـــر و تونس) بخەنە ژێر ڕکێفـــی خۆیانەوە، وە لە ســـەردەمی پاشـــا (ســـولەیمان قانونی)دا (١٥١٢-١٥٢٠)ز توانیویانە هەموو ناچەی شـــام و حیجازو نیمچـــە دورگەی عەرەب بخەنـــە ژێر قەڵەمـــڕەوی خۆیانەوەو لە شـــەڕی (چالدێران)دا کۆتایی بە دەســـەڵاتی ســـەفەویەکان بهێنن. ئـــەم دەوڵەتە لەگەڵ فراوان بوونـــی خاکەکەیدا چەند جارێک پایتەختـــی خەلافەتەکەی گۆڕیوە،

سەرەتا لە شـــاری (یانی ســـەهیر ١٢٨٠ - ١٣٦٦)، پاشـــان (ئەدێرنە ١٣٦٦- ١٤٥٣) دواتر دوای رزگار کردنی شـــاری (قوســـتەنتینیە) (ئەســـتەنبوڵ) لە ســـاڵی (١٤٥٣) ز ئەوێ دەکـــەن بە پایەتەخت. ئـــەم بنەماڵەیە (ئال عوســـمان) توانیـــان بۆ ماوی شـــەش ســـەدە خەلافەتێکی ئیســـلامی لە ناوچەی قەڵەمڕەوی خۆیان بنیات بنێن، ئێمـــە لە ســـەروبەندی هەڵســـەنگاندنی ئەم وڵاتـــەدا نین، بـــەڵام دەتوانی بڵێین یەکێـــک بووە لە هەرە وڵاتە زلهێزەکانی ســـەردەمی خۆی، دەوڵەتی عوســـمانی لە سەردەمی ســـوڵتان (ســـولەیمان قانونی و سوڵتان ســـەلیمی) کوڕیدا گەیشتووەتە ئەو پـــەڕی بەهێزی کـــە هەوڵی داگیـــر کردنی وڵاتانـــی ئیتاڵیاو ڤیەننـــای داوە، سروشـــتی دەســـەڵات و فەرمانڕەوایەتیش وایە بـــەدەر نیە لە خاڵـــی لاوازو خاڵی بەهێـــزو دادپەروەری و ســـتەم کردن و هتـــد ... تا دەگاتە ئەوەی لە کۆتا ســـاڵانی فەرمانڕەوایەتـــی ئـــەم دەوڵەتەدا ناوزەنـــدی دەکەن بە (پیاوە نەخۆشـــەکە) و بە لاوازی بەشـــداری جەنگـــی یەکەمی جیهانـــی دەکات و پاشـــان وردە وردە بەرەو پاشەکشـــە دەڕوات و شـــۆڕش و بزوتنەوەی جیاواز جیاواز لە ناوخۆی وڵاتدا ســـەر هەڵدەدەن و ســـەرئەنجام بـــە فەرمانی (کەمال ئەتاتورک) لە ســـاڵی (١٩٢٢)ز ئەم دەوڵەتـــە نامێنێت و دەوڵەتـــی تورکیای نوێ جێـــگای دەگرێتەوە.

**ســـێیەم/ کیشـــوەری ئەفریقیـــا:** زۆربـــەی وڵاتانـــی کیشـــوەری ڕەش لە ژێر داگیـــرکاری هـــەردوو زلهێزی ئەو ســـەردەمە (بەریتانیـــا و فەڕەنســـا) دابووە. لە ناوەڕاســـتی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیســـتەمەوە هەوڵی بە دەستهێنانی ســـەربەخۆییان داوەو بوون بە ســـەرۆکایەتی و کۆماری، هەندێ وڵاتی کەم نەبێت کە تا ئێســـتا پاشـــایەتین لەوانـــە: (ئۆغەندا) یەکێکـــە لەو وڵاتە پاشـــایەتیانەی لە لایـــەن چوار پاشـــاوە بەڕێوەدەبرێـــن و هەریەکێکیان ســـەرۆک هۆزێکە.

- وڵاتی لیبیا پاشـــایەتی بوو هەتا شۆڕشـــی (فاتیح) لە ســـاڵی (١٩٦٢)ز کۆتاییان بە حوکمـــی پاشـــایەتی هێناو بنەماڵەی پاشـــا (ئیدریـــس) کـــە فەرمانڕەوایەتی وڵاتیـــان دەکرد لـــە وڵاتی لیبیـــا وەدەرنران و ئێســـتا لـــە وڵاتی (ئـــوردن) ژیان بەســـەر دەبەن .

- وڵاتـــی میـــسر فەرمانڕەوایەتیەکەی پاشـــایەتی بـــوو تا ســـاڵی (١٩٥٢)ز لەم بـــەروارەوە کۆتاییان بە دەســـەڵاتی پاشـــا (فـــاروق) هێناو، ئێســـتا کۆماریە.

- وڵاتـــی مەغریـــب پاشـــایەتیەو لـــە ســـەدەی شـــانزەی زاینیەوە لـــە لایەن بنەماڵەیەکی بـــە ڕەچەڵەک (عەلـــەوی)ەوە، کە دەچنەوە ســـەر بنەچەی ئیمامی عەلـــی (رەزاو رەحمەتی خـــوای لێبێت) بەڕێوە دەبرێت، وە لە ســـاڵی (١٩٦٢) بوو بە پاشایەتی دەســـتوری و (محەمەدی شەشـــەم) لە ئێستادا پاشـــاو فەرمانڕەوایە.

- وڵاتی ســـوازیلاند پاشـــایەتیەو، پاشـــای ئێســـتایان کەم تەمەن ترین پاشـــای جیها نە .



منتدى إقرأ الثقافي

## بنەماڵەی بۆش و بە ناوبانگترین ئەو خانەوادانەی لە سەردەمی نوێدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان بەڕێوەبردووە

وڵاتـــی ئەمریـــکا یەکێکە لـــەو وڵاتانەی کـــە لە لایـــەن چەنـــد بنەماڵەیەکەوە بەڕێوەدەبرێن، واتە ڕێژەی لە ســـەدا یـــەک لە کۆی (٢٥٠) ملیۆن ڕێژەی دانیشـــتوان، ئەم بنەماڵانە دەســـتیان گرتووە بەســـەر کۆمپانیـــاو کێڵگەکانی نـــەوت و بازرگانی و بانکەکان و هتـــد... بنەماڵەی بۆش یەکێکە لەو بنەماڵانە کە توانیویەتی ســـەرکەوتوانە هەر دوو دەســـەڵاتی ئابـــوری و ڕامیاری کۆبکاتـــەوە، ئەمەش ئەوەیە کە ســـەرۆکی پێشـــووتری ئەمریـــکا (ئایزنهاوەر) هۆشـــداری لەســـەر داوە و بـــە هۆکارێکی داناوە بۆ فشـــەڵ بوونـــی پایەکانی دیموکراســـی لە وڵاتدا، هاوکات نوســـەری بـــە ناوبانگی ئەمریکـــی (کیفین فیلیبس) لـــە کتێبە بە ناوبانگەکەیـــدا (بنەچە فەرمانـــڕەواکان لە ئەمریکا) باس لە بنەماڵەی (بۆش) دەکات، کە چۆن لە ســـەرەتای ســـەدەی نۆزدەوە لە دەستەیەکی ســـەرمایەگوزارەوە لە بانکەکاندا چۆن بەرەو لایەنە سیاسیەکە هەڵکشاون، هاوکات لە ڕێـــگای چەندیـــن کۆمپانیای زەبەلاحـــەوە توانیویانە کاریگەری لەســـەر هەڵبژاردنەکان و دیاریکردنی ئەندامانی کۆنگرێس و پشـــتگیری کردن و سەرخســـتنی چەندین کەســـایەتی سیاســـی بکەن، لـــەو کۆمپانیایانە ( ئا نـــر ۆ ن ، هالیبورتـــن)ە، لە هـــەزارەی سێهەمیشـــدا ڕۆڵیان هەبـــووە لە هەڵگیرســـاندنی چەندین شـــەڕی کاولکار و ماڵ وێرانکەر بۆ ساغ کردنەوەی کاڵا سەربازیەکانیان.

ئـــەم بنەماڵەیـــە لـــە ڕووی بیروبـــاوەڕەوە (مەســـیحی جولەکـــەن) زۆر تونـــدڕەون و لـــە ڕێگـــەی تەوراتەوە خوێندنـــەوە بۆ ئینجیل و مەســـیحیەت دەکـــەن و تەنانـــەت باوەڕیان بـــە مەزهەبە مەســـیحیەکانی ئـــەم ســـەردەمەش نیە !!





منتدى إقرأ الثقافي

**١- باپیرەی یەکەم**

جۆرج بۆشـــی گەورە باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیەو ئیلهام بەخشـــی ســـەرجەم ئەندامانـــی خێزانەکەیـــە، یەکێک بووە لـــە وتاربێژە (لۆثەر)یـــە[8] توندەکانی ئاینی مەســـیحی و ئەندامێکی کارای یەکێک لە کەنیســـەکانی ویلایەتی (ئەندیانا) بووە، هاوکات مامۆســـتای زمانی عیبری و کۆلێـــژی ئادابی رۆژهەلاتی ناوەڕاســـت بووە لە زانکـــۆی نیۆرک.

جـــۆرج بـــۆش خاوەنـــی چەندیـــن لێکۆڵینەوەیە لەســـەر مســـوڵمانان و رۆژهـــەلات، هاوکات نوســـەری کتێبـــی (محمد مؤســـس الدین الأســـلامي و مؤســـس إمبراطورية المســـلمين) لە ســـاڵی (١٨٣٠)ز ئـــەم کتێبە بـــە یەکێک لـــە کتێبە پـــڕ لـــە ڕق و کینەو بە هەڵـــە تێگەیشـــتن بەرامبەر بە ئیســـلام و مســـوڵمانان و مێژوویـــان و ژیانی پێغەمبەرمان (درودی خودای لە ســـەربێت) دادەنرێت.

هەروەها کۆمەڵێک لێکۆڵینەوەی لەســـەر (تەورات) و ئەســـفارەکانی کردوەو، کتێبـــی (وادی الـــرؤی) بە یەکێـــک لـــە ســـەرچاوە هزریەکانی گروپـــە زایۆنیە ئەمریکیـــەکان دادەنرێـــت، لەو مێـــژووەوە (بـــۆش) ی باپیرە هەوڵ و کۆششـــی زۆر کـــردوە بـــۆ کۆکردنـــەوەو نیشـــتەجێ کردنـــی جولەکەکانی دونیـــا لە وڵاتی فەڵەستین، هاوکات دەســـت بەســـەرداگرتنی ئەوەی پێی دەوترێت زەوی تەوراتی کـــۆن و لەناوبردنـــی (ئیمپراتۆریەتی ســـارازان) واتە زەوی عەرەب و مســـوڵمانان.

نوســـین و بڵاوکراوەکانی (بۆشـــی باپیرە) لـــە کتێبخانەی زانکۆی (میشـــیگان) پارێـــزراوە، هەروەها بە تەوراتـــی نوێ ناوبـــراوەو زۆرێک لە ئاڕاســـتەو ڕێنمایی لێـــوە وەردەگـــرن، لێرەوە بۆشـــی کـــوڕەزا بە زمانی خـــۆی دەڵێت من ویســـتی خودام و لە جەنگەکانی ئەفغانســـتان و عێراق بە ئاشـــکرا دەیـــوت ئەمە جەنگی خاچ پەرستانە.

---

٨ مارتن لوثەر لە ساڵی (١٤٨٣)ز لە ئەڵمانیا لە دایکبووە، بانگەشەی بۆ چاکسازی و ئیسڵاحات کردوە لە ئاینی مەسیحیەتداو داوای گەڕانەوەی کردوە تەنها بۆ ئینجیل، خاوەنی مەزهەبی (پرۆتستانت)ە.

منتدى إقرأ الثقافي

**٢- (بریسکوت بوش) باپیرەی دووەم.**

باوکــی جۆرج بۆشــی بــاوک بەکێکی ترە لــە نهێنیەکانــی ئــەم بنەماڵەیە، بەڕێوەبــەری یەکێــک لــە بانکەکان بــووە لــە وڵاتــی ئەمریکا، لــە جەنگی جیهانــی دووەم خەریکی ســپیکردنەوەو بردنــە دەروەی پارەی پیــاوە بەناوبانگ و دڵســۆزەکانی هیتلەر بووە تا لە ســاڵی (١٩٤٢)ز دەســت بەســەر بانکەکەیدا گیــراو هەڵوەشــێندرایەوە، ئەو کاتە ســامانەکای بە حەوت ســەد و پەنجا هەزار دۆلار دەخەملێنرا.

هــاوکات خاوەنــی کۆمپانیایەکی هێڵی ئاســمانی بووەو بە ئاشــکرا هاوکاری وســیخوری پیاوانــی هیتلەری دەکــرد، ئەم کۆمپانیایــەش داخرا بە پێی یاســای مامەڵــەی بازرگانی لەگــەڵ دوژمن لە ســاڵی (١٩٤٢)ز.

ئەم پیــاوە لەبەر ئــەو پەیوەندیانەی لەگەڵ بەرپرســانی ئــەو کاتەی (CIA) هەیبووە دەربــازی بووە لە هەموو دادگایی کردن و لێپرســینەوەیەک. ســەرباری هەمــوو ئەمانــە کۆمەڵەی (نورانیــەکان) پشــتگیریان کرد بۆ بوون بــە ئەندامی ئەنجومەنــی پیران لە نێوان ســاڵانی (١٩٥٢- ١٩٦٣) (بریســکوت بوش) یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی (الجمجمة و العظام) (کاســە ســەرو ئێســک) و شەرابی لە کاسە ســەری ســەرۆک هۆزی هیندیە ســورەکان (ألاباتشي) (جیرونیمو) کە لە ســاڵی (١٩٠٩)ز مردوە، خواردوەتەوە !

**٣- جۆرج بۆشی باوک**

لــە ســاڵی (١٩٢٤)ز لە دایکبووە لە ویلایەتی (ماساچوســت) بــووە بە ئەندام لە پارتــی کۆماری و دواتر لە ســاڵی (١٩٦٦)ز بووە بە ئەندامی کۆنگرێس پاشــان بــووە بە باڵیۆز لە نەتــەوە یەکگرتووەکان لە نێوان ســاڵانی (١٩٧١- ١٩٧٢) ز.

پاشــان بووە بە ســەرۆکی دەزگای هەوڵگــری (CIA)، دواتر لە نێوان ســاڵانی (١٩٨١- ١٩٨٨) بــووە جێگــری ســەرۆک (ڕۆناڵد ڕیگان)، هەر لــە ماوەی جێگری ســەرۆکایەتیدا بە نهێنــی ڕۆکێتی (تاو) دژە تانکیان دەفرۆشــتە ئێــران و چەکی کیمیاوی بە وڵاتــی عێراق.

لە ساڵی (١٩٨٩) بووە بە سەرۆکی ژمارە (٤١)ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

رووداوەکان لە سەردەمی ئەمدا بریتی بوون لە دابەزاندنی هێزەکانی ئەمریکا لە وڵاتی پەنەماو دەستگیر کردنی سەرۆکەکەیان (نۆرییگا) بە تاوانی بازرگانی کردن بە مادە هۆشبەرەکان. لە ساڵی (١٩٩٠) سەرکردایەتی هاوپەیمانیەتیەکی گەورەی کرد بۆ دەرەکردنی وڵاتی عێراق لە کوەیت، پاشان لە ساڵی (١٩٩١) گەمارۆیەکی گەورەی ئابوری کرایە سەر عێراق تا ساڵی (٢٠٠٣) بەردەوام بوو. لە ساڵی (١٩٩٢) فەرمانی کرد بە دابەزاندنی هێزەکانی ئەمریاکا لە وڵاتی سۆماڵ بە ناوی تیرۆر و ئیرهابەوە، لەم پرۆسەیە (١٨) سەربازی ئەمریکا کوژراو ئاستی جەماوەری زۆر دابەزی.

٤- جۆرج بۆشی کوڕ

چل و سێیەمین سەرۆکی ئەمریکایە، لە ساڵی (١٩٤٦)ز لە دایکبووە، تا تەمەنی پانزە ساڵی لە پەنای خێزانەکەیدا بووە دواتر بۆ تەواو کردنی خوێندن لە خێزانەکەی دورکەوتوەتەوە. لە ساڵی (١٩٦٨) زانکۆی تەواو کردوە،، هەر زوو پەیوەندی کردوە بە رێکخراوی (الجمجمة و العظام) (کاسەسەر و ئێسك) توانیویەتی بە ئاشکرا وێنەی سەرۆکی رێکخراوەکە ببینێت و چەند وێنەیەکی لە شوێنی تایبەت بە خۆیان هەڵواسراوە کە تیایدا سڵاویان لێدەکات بە شێوازی شەیتان پەرستەکان.

پاشان کۆمپانیای (بوش) بۆ گەڕان و دۆزینەوەی نەوت دادەمەزرێنێت (Fio2) هەروەها بۆ ماوی یانزە ساڵ فڕۆکەوانی فڕۆکەی شەڕکەر بووە، ئەم بوارە جیاوازانە شارەزایی و ناسیاوی زۆری بۆ دروستکرد.

رووداوی یانزەی سێپتەمبەر (٢٠٠١) لە سەردەمی ئەمدا رویدا، (کە تا ئێستا وردەکاری و چۆنیەتی و کێ لە پشت رووداوەکانیەوە بووەو چ دەزگایەک کار ئاسانی بۆ کردون روون نیە)، ئەمەش بەهانەی لەلا دروستکرد کە هێرش بکاتە سەر چەند وڵاتێکی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و، ئەم سەرۆکە

لەم هەڵمەتی شــەڕ کردنانەدا بۆ ســەر هــەردوو وڵاتی (عێراق و ئەفغانســتان) چەندین دروشــمی مەســیحی توندڕەوی بەکارهێنا وەک (شــەڕی پیرۆز، شــەڕی خاچ پەرســتان تــەواو دەکەین) دەتوانین بڵێیــن ئەم ســەرۆکەو بنەماڵەکەیان لە مەســیحی ئینجیلیەکانــن و زۆر تونــدڕەون، وە باوەڕیان وایە دەبێــت دەوڵەتی جولەکە دروســت بێت ئەوســا عیســا پێغەمبەر (ســەلامی خوای لەســەر بێت) دێتەخوارەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

**یەکێتی دەسەڵات و پارەو دەوڵەمەندترین خانەوادەکانی فەڕەنسا و میسر**

دوو رۆژنامەنووسی فەڕەنسی کە لە بواری ئابوری و بانکەکاندا دەنووسن بە ناوەکانی (بییر هـنری، ئەریـک تریغییە) لەم ساڵانەی دواییدا کتێبێکیان نوسیوە سەبارەت بەو دوو سەد بنەماڵەیەی دەوڵەمەندن لە فەڕەنسا لە پێشەکی کتێبەکەدا باسی وتارێکی سەرۆک وەزیرانی فەڕەنسا دەکات کە لە ساڵی (١٩٣٤)ز دا وتوویەتی، دەڵێت دەوڵەتی فەڕەنسا بە تەواوی کەوتووەتە ژێر فشارو کاریگەری دەوڵەمەند و بانکە تایبەتەکانەوە، بێگومان ئەمەش پێچەوانەی بنەما سەرەکیەکانی شۆڕشی فەڕەنسایە، لێرەوە پارتە ئیشتراکیەکان هەمیشە لە هەوڵی دەرکردنی یاسا و لێدان لە بەرژەوەندی ئەم بنەماڵە دەوڵەمەندانە بوون، یەکەم بڕیارێک سەرۆک (میتران) و ئیشتراکیەکان لە کاتی هاتنە سەر دەسەڵات دەریان کرد لە ساڵی (١٩٨١)ز سەپاندنی باجێکی زۆر بوو لەسەر دەوڵەمەندەکان و دابەشکردنی بەسەر هەژارەکاندا.

ئەمەش زنجیرەی دە بنەماڵەی هەرە دەوڵەمەندە لە وڵاتی فەڕەنسا:

**١- بنەماڵەی (بیتینکور):** دەڵەمەندترین بنەماڵەیە لە ئێستادا سامانەکەیان تا ساڵی (٢٠٠٣) نزیکەی (١٥) ملیار دۆلار بووە !! کارەکەیان لە بواری جوانکاری و بۆیاخی پرچدا بووە، خاوەنی کۆمپانیای (لوریال)ی بەناوبانگن.

پیاوی یەکەمی ئەم بنەماڵەیە (ئەندریە بیتینکور) زۆر بەناوبانگە هاوڕێی (فرانسوا میتران)ە، وەزیر بووە لە هەر دوو حکومەتی (شارل دیگول وجۆرج بومیدو)؟ توانیویەتی سەرنجی ڕاستڕەوەکان و چەپەکانیش بۆ خۆی رابکێشێت.

**٢- بنەماڵەی (مولییز):** خاوەنی گەورەترین کۆگای کڕین و فرۆشتنن تایبەت بە سۆپەرمارکێتی (ئۆشان) تا ساڵی (٢٠٠٣) سامانەکەیان لە دەوروبەری (١١) ملیار یۆرۆدا دەبوو.

**٣- بنەماڵەی (ئارنۆ):** ئەم بنەماڵەیە بە تایبەت خەریکی دروستکردنی کەل و پەلی ئەنتیک و ڕاقی و گرانبەها و جوانکاری ناوماڵن، سامانەکەیان تا ساڵی (٢٠٠٣) نزیکەی (١٠) ملیار یۆرۆ بووە.

**٤- بنەماڵــەی (بینو):** ســامانەکەیان نزیکــەی (٤) ملیار یــۆرۆ دەبێت تایبەت خەریکــی دروســتکردنی کــەل و پەلــی جوانکاری و دابەشــکردنی شــتومەکی رۆژانەی ســۆپەرمارکێتەکانن.

**٥- هــەر ســێ بنەماڵەی** (دۆمــا، **بویش، گیــران): ئەمانە ســەرقاڵی بازرگانی کــەل و پەلی جوانکارین ســامانەکەیان نزیکــەی (٣) ملیــار و نیو دەبێت.**

**٦- بنەماڵــەی (داســو):** ســامانەکەیان لە دەوروبەری (٣) ملیارو ســێ ســەد ملیــۆن یۆرۆدا دەبێــت، لە رابــردوودا دەوڵەمەندترین بنەماڵەی فەڕەنســا بوون، بەڵام ئێســتا لە پلەی شەشــەمدان و هــاوکات لە بواری پیشەســازی و فڕۆکەوانی و دەرکردنی چەنــد گۆڤارو رۆژنامەیەکدا ســەرقاڵن.

**٧- بنەماڵەی (هالی):** ئەم بنەماڵەیە ســامانەکەیان (٣) ملیار و ســەدو بیست و چوار ملیــۆن یۆرۆیە، تایبەت لە بواری بازاڕ کردن و کەرەســتەو شــمەکی رۆژانە ســەرقاڵن، خاوەنی کۆگای بازرگانی زۆر گەورەن وەکــو کۆگاکانی (کارفۆر).

**٨- بنەماڵــەی (بیجۆ):** ســامانەکەیان نزیکەی (٢) ملیارو نیــو دەبێت، خاوەنی کارگەی دروســتکردنی ئۆتۆمبێلی (بیجۆ)ن.

**٩- بنەماڵــەی (لویس دریفــوس):** ئەم بنەماڵەیە ســامانەکەیان (٢) ملیارو دوو ســەد و چل ملیۆن یۆرۆیە، تایبەتمەندن لە دروســتکردنی کەرەســتەی ســەربازی وەک (بەلەمی شــەڕکەر و ژێر دەریایــی و هتد...).

**١٠- بنەماڵــەی (رۆتشــێلد):** ئەم بنەماڵەیە ســامانەکەیان (١) ملیار و شــەش ســەد و حەفتــاو پێنج ملیۆن یــۆرۆ دەبێــت، لە بــواری بانکــەکان و بازرگانی خواردنــەوە کحولییەکانــدا کاردەکەن، ئــەم بنەماڵەیە جولەکەن و لــە ئەوروپادا زۆر بەناوبانگــن لە ئەڵمانیاوە هاتوون و ســەرەتا بە فرۆشــتنی قــاپ و قاچاغ و کەرەســتەی ناوماڵەوە ســەرقاڵ بوون، دواتــر دەوڵەمەند بوون و لــە بواری کار بانکــی و ئاڵو وێــری دراودا درێژەیان بــە کارەکانیان داوە.

• **وڵاتــی میسر:** بــە هەمان شــێوە چەنــد بنەماڵەیــەک لــە رووی رامیاری و ئابوریەوە دەســتیان بەســەر زۆر بــواردا گرتبــوو .. باوکێکی وەزیــر دەبووایە

کوڕەکەشــی دوای خۆی ببێت بــە وەزیر .. ســەرۆکی پارتە سیاســیەکان دەبێت کوڕەکانیان ئامادە بکەن بۆ شــوێنی خۆیــان .. خاوەن کۆمپانیــاکان راهێنانیان بە کوڕەکانیــان دەکرد بۆ ئــەوەی ببن بە ســەرۆکی بەڕێوەبەرایەتــی کۆمپانیاکان ..

• **بنەماڵەی غالی:** بۆ ماوەی چەند دەیەیەک کورســی خۆیــان لە فەرمانڕەوایەتی وڵاتی میسردا داگیرکردبوو، پێش شــۆڕش (بوترس پاشــا غالی) ســەرۆکی ئەنجومەنی وەزیــران بوو، پاشــان بۆ نەوەکــەی (بوترس بوتــرس غالی) دوای ئەو بۆ (یوســف بوترس غالی) کــە بۆماوەی چەندین ســاڵ وەزیری دارایی وڵاتــی میسر بوو!؟

• یەکێکی تر لە بنەماڵە دەســت رۆیشــتووەکان بنەماڵــەی (موکەڕەم عوبێد)ە کە پێش شــۆڕش خاوەنی زەوی و زارێکــی زۆربوون لە (ســەعیدی میسر) ناوبراو ســکرتێری پارتی (وەفــد) بوو، پاشــان (فکری موکــەڕەم عوبێــد) وەک جێگری ســەرۆک وەزیران لە ســەردەمی (ئەنوەر ســادات)، دواتر (دوکتۆرە مونا موکەڕەم عوبێــد) وەک پەرلەمانتار، لە کۆتاییــدا (دوکتۆرە نادیە موکــەڕەم عوبێد) وەزیری ژینگــە لە حکومەتی (دکتــۆر جەنزەوەری).

• یەکێکی تــر لە بنەماڵە دەســت رۆیشــتووەکان بنەماڵــەی (محێدین)ە کە (خالیــد و زەکەریا)یــان ئەندامی ســەرکردایەتی شــۆڕش بــوون، ئەندامانی ئەم بنەماڵەیــە لە هــەردوو لا دەبیــنران واتە دەســەڵات و نەیاران .

لــە کاتی دروســتبوونی پارتــی (وەفــد)دا، هــەر دوو بنەماڵەی (ســیراج الدين و بەدراوی) دەســتیان بەســەر بەڕێوەبردنی ئەم پارتەدا گرت تاوەکو ئەم ســاڵانەی دوایی.

هاوکات لە پارتی (ئومە) ســەرجەم پۆســتە بــاڵاکان لە لایــەن بنەماڵەی (ئال ســەباحی)ەوە بەڕێوەدەبرێت.. زۆرێک لە بیرمەندانی وڵاتــی میسر ئەم دیاردەیە بە دەرەبەگایەتییەکی نــوێ ناوزەند دەکەن.

بنەماڵە هەیە بە میراتــی پەرلەمانتاریان بۆ ماوەتەوە، وەک بنەماڵەی (نەســار لە ئەســیوت) بنەماڵەی (باســل لە فەییوم) بنەماڵەی (کاشــف لە عەریش) هتد...

لــە بواری ئابوری و ســامان زۆریدا ئــەم بنەماڵانە زۆر بــە ناوبانگن (ئەحمەد عوســمان ئەحمەد، ساویرس، مەنســور ئەفەندی، مونتەســیر، ئەبولفتوح، موفتی،

منتدى إقرأ الثقافي

شـــەلقانی، عەدلی ئەیوب، عبدالنور، بنەماڵەی ســـعودی، هتد..)

بە هەمان شـــێوەی فەڕەنســـا و زۆرێک لـــە وڵاتانی جیهان و میـــسرو زۆر وڵاتی تر کە بوون بە کۆماری بە شـــێویەکی ورد چەند بنەماڵەو کەســـایەتیەک توانیویانە دەســـت بگرن بەســـەر هەر دوو بوارەکەدا جیهانی سیاســـەت و رامیاری، جیهانـــی پارەو دارایی!!

**گرنگترین ئەو بنەماڵەو خانەوادانەی دەستیان بەسەر جیهاندا گرتووە**

حەڤـــدە بنەماڵە لە ئێســـتادا جیهـــان بەڕێوەدەبەن لە ڕێـــگای هاوپەیمانیەتی بەســـتن لەگەڵ نورانیەکاندا.

بە ناوبانگترین ئەو بنەماڵانە ئەمانەن:-

- بنەماڵەی ئاستور
- بنەماڵەی کۆلینز
- بنەماڵەی کینیدی
- بنەماڵەی ئۆناسیس
- بنەماڵەی ماکدوناڵدز
- بنەماڵەی کروب
- بنەماڵەی روکفیلیری ئەمریکی
- بنەماڵەی میروفینجین
- بنەماڵەی دزنی
- بنەماڵەی دوبوند
- بنەماڵەی لی
- بنەماڵەی روتشیڵد
- بنەماڵەی بوندی
- بنەماڵەی فریمان
- بنەماڵەی روسل
- بنەماڵەی فان دوین
- بنەماڵەی ڕاینوڵدز

منتدى إقرأ الثقافي

**١- بنەماڵەی ئاستور:**

بنیاتنەری سـامانی ئەم بنەماڵەیە (جـۆن جیکب ئاسـتور)ە (١٧٦٣ -١٨٨٤)ز ژیاوە، لە شـاری (وڵـدورف)ی ئەڵمانیا لـە خانەوادەیەکی جولەکە لـە دایکبووە، بە کاری قەسـابیەوە سـەرقاڵ بووە، هەوڵـی دەدا جولەکەیی خۆی بشـارێتەوە دواتر بـەرەو وڵاتـی بەریتانیا کـۆچ دەکات و بـۆ ماوەیەک لە شـاری لەندەن دەبێت و پاشـان لـە سـاڵی (١٧٨٤) دەچێتـە ئەمریـکاو لەوێ بـە تەواوەتی نیشـتەجێ دەبێـت. دەوترێـت کاتێک گەیشـتە ئەمریکا خاوەنی یەک سـەنت نەبـووە، پەیوەنـدی دەکات بە ماسـۆنیەکانەوە لە ماوەی سـێ سـاڵدا دەبێت بە بەرپرسـی فەرمانگەی (ژمارە هەشـت) لە شـاری نیویـۆرک (ئەمریکا یەکەم وڵاتـە کە ماسـۆنیەکان بەڕێوەی دەبـەن)، ئەم پیـاوە لـە ڕووی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیـەوە زۆر سـاردو لاواز بوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی ماسـۆنیەکان پشـتیان گرت و مەبەسـتیان بـوو دەرکەوێت بـوو بە کەسـێکی دیاری ماسـۆنیەکان لە وڵاتـی ئەمریکا.

سـەرەتای کۆکردنەوەی سـەروەت و سـامانی ئـەم پیاوە لە ڕێـگای مۆڵەت پێدانـی تایبەتـی بە کەشـتیەکانی ئەم بـە ئاڵ و وێرو گواسـتنەوەی شـمەک دەسـتی پێکـرد و ئەمـەش لـە سـاڵی (١٨٠٧) لە لایەن سـەرۆکی ئـەو کاتی ئەمریـکا (جیفرسـون) و یەکێک لـە وەزیرەکانیەوە بـە ناوی (جلاتیـن) ڕێگە پێدانـی تایبەتیان بۆ کرد، شـایانی باسـە هـەر دوو ناوبراو ماسـۆنی بوون، لەم ڕێگایـەوە نزیکـەی (٢٠٠) هـەزار دۆلاری پێکەوەنا.

لە نێوان سـاڵانی (١٨١٧-١٨٣٤) سـەرقاڵی بازرگانی کردن بـووە بە فەروەی ئاژەڵانـەوە کە لەو سـەردەمەدا بـاوی بووە، پاشـان لە ڕێـگای لیژنەی (٣٠٠) سـێ سـەدەوە کە دەسـەڵاتیان بەسـەر هەموو ئەمریکادا هەبوو کارئاسانی بۆ کـرا بۆ بازرگانی کـردن بە مـادە هۆشـبەرەکانەوە لەگەڵ وڵاتی چیـن، دواتر سـەرقاڵی کڕین و فرۆشـتن بووە لـە زەوی و زاردا، وا وتراوە کـە زۆربەی زەوی و زاری شـاری نیویـۆرک هی ئەو بووە! لـە بواری بانک و پشکەکانیشـدا کاری

زۆری کــردووەو ســامانی زۆری پێکەوەنــاوە ئەمــش کاتێک بوو کــە لە لایەن (هاملتــۆن)ەوە بانکی گەورەی ئەمریــکا دامەزراو (ئاســتور)یش بوو بە یەکێک لــە ئەندامانی ئــەو بانکە، بەم شــێوەیە (ئاســتور) بــوو بــە ژمارەیەکی دیار لە وڵاتــی ئەمریکا، دواتر کــۆچ دەکات بۆ وڵاتــی بەریتانیاو لەوێ نیشــتەجێ دەبێت و ســەرمایە گــوزاری دەکات هاوکات لــە وڵاتی ئەمریــکاش کۆمپانیاو پشــکی بانکی هــەر دەمێنێت. ســامانی ئــەم بنەماڵەیە بــە (٤٠) ملیار دۆلار دەخەملێنرێت.

بەڵگەی بەهێــزی ئەم بنەماڵەیــە وەکو بنەماڵە فەرمانڕەواکان دەســەڵات بــۆ نێرینــەکان دەگوازرێتــەوە وەکــو پاشــایەتی، یەکێــک لــە ســەرۆکە بەناوبەنگەکانــی ئــەم بنەماڵەیە (فینســنت ئاســتور)ە ئەم پیاوە ســامانی بنەماڵــەی چەند هێنــدە زیاد کــرد، (فینســنت) ئەندامی کارگێــڕی دەیان کۆمپانیا بــووە لەوانە:

١- ئەمریکان ئەکسپرس

٢- بانکی تشیس مانهاتن

٣- سیتی ئاندبیریان هومز

٤- بانکی ناشناڵ پارک لە نیویۆرک

٥- کۆمپانیای ئەتلانتیک بۆ بازرگانی میوەو- شەکر

٦- تامیز ویسترن یونیون تەلەگراف لە نیویۆرک

هەروەهــا لە بــواری راگەیاندنیدا دەســتیان گرتووە بەســەر رۆژنامەی (تامیز لەندەنی)، رۆڵیــان هەبووە لە دروســتکردنی چەندین رێکخــراوی خێرخوازی کە یارمەتــی کەنیســەکان دەدات بەهۆی ئەمەوە ســاڵانە دەبەخشران لــە دانی باج کــە لە دەوری (١٠٠) ملیــۆن دۆلار دەبێت.

ئەندامانــی خێزانی ئاســتور ئەندامن لە هــەردوو رێکخراوی نهێنی ماســۆنی (ئەکســل ئاندبونز)، ئەنــدام و دامزرێنەر لە (گروپەکانی مێــزە خڕەکان) (Round Table Groups).


منتدى إقرأ الثقافي

هاوکات لە پشــت ســەرجەم ئەو بەخشــینانەوە بوون کە تەرخــان دەکرا بۆ خوێنــدکارە زیرەکەکانی وڵاتانی جیهانی ســێیەم، وە هاوکاری مــادی باش دەکران و دواتــر بەکاردەهێنران و دەکرانە ئەنــدام لە ڕێکخراوە ماســۆنی و نورانیەکاندا، بێگومان ئەم خوێندکارانەش بە پیلان و نەخشــەی ئــەو ڕێکخراوانەوە دەگەڕانەوە وڵاتەکانیان !؟

هەروەهــا بنەماڵەی ناســتور لە پشــت پەیمانگای شــاهانە بــۆ کاروباری دەرەوە و، دانشــگەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەمریکاوەیە ؟! ئەم دوو دەزگا هەســتیارە لە پشــت زۆرێــک لــە بڕیارەکانی هــەر دوو وڵاتــی (ئەمریکاو بەریتانیا)وەن.

## ٢- بنەماڵەی ماکدونالْدز:

یەکێکــە لە گرنگترین بنەماڵە گەورەکان کە دەســتیان بەســەر جیهاندا گرتووە، تایبەتمەندن لە دروســتکردنی خواردەمەنــی لە ڕێگای زنجیرەیەک چێشــتخانەی بەناوبانــگ کــە ژەمی خێرا پێشــکەش دەکەن، (ســی هــەزار) لقیــان هەیە لە (١٢٠) وڵاتدا.

مێژووی بنیاتنانی ئەم چێشــتخانانە ســەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٤٠) ز لەســەر دەســتی هەر دوو بــرا (دیک و مایک) لــە ناوچەی (ئــۆک برۆک) لە ئەمریکا.

قازانجــی ئەم کۆمپانیایــە تا ســاڵی (٢٠٠٦) نزیکەی (١٤) ملیــار دۆلار بووە، بنەچــەی ئــەم خانەوادەیــە بەم شــێوەیەیە (کاپــتن ماکدۆناڵدز) کە بە ئەســڵ ئۆســکۆتلەندیە لەو وڵاتــە هاوســەرگیری دەکات لەگەڵ خاتوو (جین) لە ســاڵی (١٨٠٩)ز لــەوێ دوو منداڵیــان دەبێت، پاشــان کۆچ دەکەن بــۆ ئەمریکاو لەوێ هەشــت منداڵی تریــان دەبێت.

بەم شــێوەیە ئەم بنەماڵەیە بــە زۆری لــە ویلایەتەکانی ڤێرجینیاو پنســلڤانیا نیشــتەجێ دەبــن، زۆربەیــان بــە کاری بازرگانیــەوە خەریک بوون، ئاشــکرایە

منتدى إقرأ الثقافي

زۆربەیان ئەنـــدام بوون لە ڕێکخراوە ماســـۆنی و نورانیەکان و هـــاوکات هاوکاری داراییان پێشـــکەش بەم ڕێکخراوانـــە کردوە.

لـــە ســـاڵی (١٩٩١)ز حکومەتـــی ئەمریـــکا لە پـــارەی بـــاج (٤٠) ملیۆن دۆلاری بۆیـــان گێڕایـــەوە لەبەر ئەو هەوڵانـــەی کە دابوویان بـــۆ کردنەوەی (٩٥٩) لقـــی تری چێشـــتخانەکانیان لە هەر ســـێ وڵاتی (ئەڵمانیـــا، بەریتانیا، فەرەنســـا) وەک زانـــراوە ئـــەم بنەماڵەیـــە زۆربەیشـــیان ئەندام بـــوون لە ڕێکخراوی (فرســـان الهیـــکل) واتە: ســـوارەکانی گێڕانەوەی خاکـــی جولەکە و لەناویشـــیدا (هەیکەلـــی ســـولەیمان پێغەمبەر) ســـەلامی خـــوای لێبێت، ئـــەم ڕێکخراوە لـــە ســـاڵی (١٠٩٩) زاینیەوە لـــە ســـەرەتای هەڵمەتی خاچ پەرســـتەکانەوە بۆ ســـەر ڕۆژهەڵات دروســـت بوو، زۆر کەســـی بەناوبانگیان هە بـــووە لەوانە:

- ڕامزی ماکدونالد: ســـەرۆک وەزیرانـــی بەریتانیا لە ســـاڵی (١٩٢٠)ز هاوکات ئەندامی کۆمەڵـــەی نوارنیەکانیش بووە.

- ئەلونـــزو ماکدوناڵـــد: فەرمانبـــەر لە کۆشـــکی ســـپی و فەرمانـــدەی هێزی دەریایـــی ئەمریکا.

- کریســـتۆڤەر ماکدوناڵد ووکر، ئەدموند ماکدوناڵد، ئەنـــدام بوون لە (بوهیمیا گروف).

- د. غوردون ماکدۆناڵد: زانا لە بواری فیزیا.

- جۆن ماکدوناڵد: (١٨١٥- ١٨٩١)ز ســـەرۆک وەزیرانی کەنـــەدا، ناوبراو ئەندام بووە لە ڕێکخراوەکانی (ســـوارەکانی داود، ماسۆنیەت).

- بارثولومیـــو جون ماکدوناڵـــد: (١٨٤٤- ١٩١١)ز بنیاتنەری تـــۆڕی میترۆی ژێر زەوی نیویۆرک.

- سیسل جۆن ماکدوناڵد: (١٩٣٤) کەسێکی ماسۆنی لە پلەی (٣٢).

ئەم بنەماڵەیـــە توانیویانە کۆکردنەوە بکەن لە نێـــوان (پارە و رامیاریدا) لە هەر دوو بوارەکەدا توانیویانە چەندین کەســـایەتی پێشـــکەش بکەن.


منتدى إقرأ الثقافي

**٣- بنەماڵەی دوبونت:**

ئـــەم بنەماڵـــەیە وەکـــو هـــەر بنەماڵەیەکـــی تری ســـەر بـــە نورانیەکان تایبـــــەتمەندیان وەرگـــــرتووە لە بوارێکـــــدا کە ئەویــــش بازرگــــانی کردنــە بە (باروت)ەوە، واتــــە لــە کاتی داهـــــــێنانی باروتــەوە ئەمان سەرقاڵی بازرگــــانی پێوەکردن و دروستکردنـــــی تەقـــــــەمەنیەوە ســـەرقاڵ بوون.

ئەم بنەماڵـــــــەیە شـــازادەن و خانـــــــەدانن (دوبـــونت) لە وڵاتی فەرەنســـا لە دایکبووە هەر لەو وڵاتــــە لە ســـاڵی (١٧٣٧)ز هاوسەرگـــیری کردوەو دوو کـــــوڕی بە ناوەکــــــانی (ســـامۆئیل و بەیار) بووە، ســـامۆئیل هەر لە سەرەتـــــاوە باوەڕی بە سیستمێکی نوێــــــــی جیهانی هـــــەبوو، باوەڕی بـــە حکومەتێکـــی ئەفـــــــلاتۆنی هەبــــــووە واتە ســـەرۆکێکی فەیلەســـوف و دانا..

بەیـــار پلـــە (٣٣) بوو لە ڕێکخـــراوی ماســـۆنیەتدا، لە کەرتـــی بازرگانی وڵاتی فەرەنســـادا پلەی پشـــکنەری گشـــتی هەبوو، ئەم بەســـەرهاتانە لە ناوەڕاســـتی ســـەدەی هەژدەدا ڕوی داوە، پاشـــان لەســـەر داوی ســـەرۆکی ئەو کاتەی وڵاتی ئەمریکا (جیفرســـۆن) لە ســـاڵی (١٧٩٩)ز کـــۆچ دەکات بۆ ئەو وڵاتـــەو لە کەرتی پـــەروەردەو فێرکردنـــدا نەخشـــە بۆ ئـــەو وڵاتە دادەنێـــت، هاوکات بـــۆ وڵاتی پۆڵەنـــداش ئەو سیســـتمەی داناوە کـــە لە بەرژەوەنـــدی ماســـۆنی و نورانیەکان بووە، بەیـــار هاوڕێی گیانـــی بە گیانی (فرانکلین) ســـەرۆک و ماســـۆنی گەورەی ئەمریـــکا بووە.

نەوەی دووەمـــی ئەم بنەماڵەیە لە بواری پشـــک و بانکەکانـــدا کاریان کردوە، (ماســـۆن ســـتیڤن جیرار) ســـاڵی (١٧٥٠- ١٨٣١)ز بانکی دووەمی لە وڵاتی ئەمریکا دروســـتکرد و تا ســـاڵی (١٨١٦)ز نزیکەی (٩) ملیۆن دۆلاری کۆکـــردەوە. ئەلفرید دوبونت ســـەرۆکایەتی ئەم بنەماڵەیەی لە ئەســـتۆ گرت و کارگەکانی دروستکردنی باروتی تا ســـاڵانی (١٨٣٣)ز بەڕێوەدەبرد.

منتدى إقرأ الثقافي

ئەم بنەماڵەیە لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا ئەندامیان زۆر بووە لەوانە:

- ریشارد کینی سیناتۆر (١٨٩٧-١٩٠٢) ز ماسۆنی.
- ئارنۆڵد سیناتۆر، ماسۆنی .
- جیمس سیناتۆر (١٩٤١- ١٩٤٧)ز، ماسۆنی.
- جۆن ویلز سیناتۆر (١٨٤٩- ١٩٥١) ز.

**٤- بنەماڵەی کروب:**

ئەم بنەماڵەیەش وەکو بەشێک لە کۆمەڵەی نورانیەکان لە ساڵی (١٨٣٦)ز دەرکەوتن، سەرقاڵی دەرهێنانی خەڵوزی بەردین بوون لە شاری پاریس، دواتر سەرۆکی بنەماڵە (ئەلفرێد کروب) لە ساڵی (١٨٣٨) کۆچی کرد بۆ ئینگلتەرا پاشان بۆ ئەڵمانیا لە ساڵی (١٨٢٩)ز.

هاو زەمان لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازیدا سەرقاڵی دەرهێنانی کانزاش بوون، پاشان لە ڕێگای کوڕەکەیانەوە کە ناوی (ئەنتوان) بوو دەستیان دایە بازرگانی چەک و تەقەمەنی لە وڵاتی ئەڵمانیا.

ئەم خانەوادەیە لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا سەرقاڵی دروستکردنی چەکی بایۆلۆجی بوون بە قازانجی ئەڵمانیا، دەوترێت سەرۆکی بنەماڵە (جوستاف کروب) چەک و تەقەمەنی بۆ سوپای ئەڵمانیا دابین دەکرد، تەنانەت بوو بوو بە راوێژکاری (هیتلەر)، دوای دۆڕانی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەم بە فەرمانی کۆمەڵەی نورانیەکان (٣٠٠) ملیۆن مارکی پێشکەش کرد بۆ دوبارە هاوکاری کردنی سوپای نازی هیتلەر و سەرلەنوێ پڕ چەککردنەوەی، دوای روخانی هیتلەر بڕیاری لە سێدارەدانی درا بەڵام جێبەجێ نەکرا ؟! هۆکارەکەشی تەنها ئەوەبوو کە (گۆستاف) بە رۆڵی خۆی هەستابوو لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی نورانیەکاندا !! لە کۆتاییدا بۆ هەموو ئەڵمانیەک دەرکەوت کە ئەم بنەماڵەیە لەسەروی یاساوەن..

**٥- بنەماڵەی کولینز (لولنس):**

یەکێکــە لــەو بنەماڵــە گرنگانــەی کە ڕۆڵیــان هەبــووە لە دروســتکردنی نورانیەکانــداو بوون بــە ئەندام تیایــدا، بنەماڵــەی (کۆلێنز) بووە لە ســەرەتادا ئــەم بنەماڵەیە لــە ئینگلتەرا نیشــتەجێ بوون پاشــان کۆچیان کــردوە بۆ زەویە نوێیەکــە واتــا (ئەمریــکا) زەوی نورانیەکان !؟

تایبەتمەندی ئەم خانەوادەیە لە جادوگەری و پەرســتنی شــەیتان و ئەو بوارەدا بــووە، بۆیە لای نوارنیــەکان بایەخی تایبەتیــان بووە، لە ســاڵی (١٦٤٠)زایینەوە بەرەو وڵاتــی ئەمریکا هاتوون و تیایدا نیشــتەجێ بوون.

(جــۆن کۆلینــز) لــە ســاڵی (١٧١٧- ١٧٩٥)ز ئەنــدام بووە لــە حکومەتی یەکگرتــووی ئەمریــکاو بانگەشــەی بۆ لێدانی ســکەو پــارەی نوێ کــردوە بۆ ئەم وڵاتــە نوێیە (ئەمریــکا)، داوای جیابوونــەوەی کردوە لە ئینگلتــەرا ئەمەش جەماوەرێکــی زۆری بــۆ دروســت کردبوو.

ئەم بنەماڵەیە زۆرێک لە کەســایەتیەکانیان ســەقاڵی بانک و پشــکەکان بوون، هــاوکات گەڕان بــە دوای نــەوت و کڕینــی زەوی و زار، لەو کەســانەش (ماثیو لولینــز، غاریت ماثیــو، تیۆدۆر کلاید، جۆنیــۆر کۆلینز، ئارســەر کۆلینز...)

لە ڕێگای ئەفســەر (ویلیام کۆلینز)ەوە بەشــداری جەنگی ناوخۆی ئەمریکایان کردوە..

ڕۆڵــی بەرچاویــان هەبووە لــە دەزگای هەواڵگــری ئەمریــکا CIA، وە ئەم بنەماڵەیە لە پشــت سەرخســتنی ئــەم ســەرۆکانەی ئەمریکاوە بــوون (ڕۆناڵد ڕیــگان، جۆرج بۆش بــاوک، بۆشــی کوڕ).

لــەم بنەماڵەیە (مایــکڵ کولینز)یان هەبووە کە کەشــتیەوانی ئاســمانی بووە لە گەشــتی(ئەپۆلۆی دوو) بــەرەو مانگ بەشــداری کردوە، ئــەم بنەماڵەیە هەر لە ســەرەتای دروســت بوونی (الجمجمة والعظام) (کاسە ســەر و ئێسک)ەوە لە ســاڵانی (١٨٢٤- ١٩٠٩)ز بەشــداری کاریگەریان هە بووە.

لــە کۆتاییدا ئــەم خانەوادەیــە لــە زۆر بــواردا وەک (هونــەر، ڕاگەیاندن،

منتدى إقرأ الثقافي

هەواڵگــری، نەوت، بانکــەکان) کاریگەریان هەبــووە، بۆیە بــە یەکێک لە هەرە بنەماڵــە هــاوکارەکان دادەنرێت لەگــەڵ نورانیەکاندا.

**٦- خانەوادەی لی چینی:**

ئــەم بنەماڵەیــە یەکێکــە لــە بنەماڵە بــە ناوبانگــەکان لە وڵاتــی (چین) مێژووەکــەی دەگەڕێتــەوە بۆ (٢٠٠) ســاڵ پێش زاییــن، (لی) یان (تشاوشــینغ) ناوێکــی میلی باوە لــە چین، (لی یــوان) دامەزرێنــەری بنەماڵــەی (تانغ)ە کە بۆماوەی (٦١٨) ســاڵ واتــە تا (١٩٠٦)ز بەردەوام بوو، لە ئێستاشــدا کەســایەتی زۆریــان هەیــە لەوانــە ملیاردێــر (هۆنــغ کۆنــغ لی شــینغ لی) و (لــی بنغ) فەرمانــڕەوای چیــن و (لی کــوان یو) دیکتاتــۆری وڵاتی ســەنغافورە.

پەیوەندیەکــی توندیان بە کۆمەڵــەی نورانیەکانەوە هەیە. ئــەم بنەماڵەیە لە ڕێگای کۆمەڵێ کەســایەتی و ســەرمایەدارو بازرگانەوە دەســتیان گرتووە بەسەر زۆر بــواری ئابوری لە هەر ســێ وڵاتی (چیــن، تایوان، هۆنــگ کۆنگ)دا.

**٧- بنەماڵەی ڕۆتشیڵدی جولەکە:**

یەکێکــە لە بنەماڵــە گرنگ و دامەزرێنەکانــی کۆمەڵەی نورانیەکان (شــەیتان پەرســتان) کە بەشــێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەســتیان بەســەر پارەو ئابوری جیهاندا گرتــوە، ئــەم بنەماڵەی(روتشــیلد)ەیە زۆر کتێــب و بابەتیــان لەســە نوسراوە، گرنگترینیــان پەرتوکی مێژوونووســی بەریتانی (نیال فیرجســون)ە کــە تێیدا باس لــە ڕۆڵی ئەم بنەماڵەیە دەکات لە دروســتکردنی دەوڵەتــی ئیسرائیل و زایۆنیزمی جیهانــی، مەترســی ئەم خانــەوادە لەوەدایە ڕۆڵ و دەســتیان هەیــە لە هەموو ئاژاوەو هەوڵــی کودەتاو هەڵگیرســاندنی جەنــگ لە سەرتاســەری جیهان و لە هەموو کیشــوەرەکان، ئــەم بنەماڵەیە بــە بنەچەی (فرانکفۆرت) یان (دەســتەی پێنج) ناسراوە، ســەرەتا لە وڵاتــی ئەڵمانیاوە دەرکەوتن کاتێــک بازرگانی گەورەی جولەکــە کە بازرگانــی بە دراوو پارە دەکرد (ئیســحاق ئەکانــان) کوڕێکی هەبوو


منتدى إقرأ الثقافي

بـــە ناوی (ئەمشـــەل موســـا) دواتر ئەویـــش کوڕێکی بـــوو بە نـــاوی (مائیر) کە بـــە دامزرێنـــەر و بنیاتنەری ئـــەم بنەماڵەی (روتشـــێلد)ه ناسراوە، وە ســـەرۆکی (دەســـتەی پێنج) بووە .

ناوی روتشـــیلدیش لەوەوە هاتووە کاتێک (ئەمشـــەل موســـا) لە ساڵی (١٧٥٠) ز دوکانێکـــی زێڕینگـــەری ئاڵوگۆڕی دراوی هەبوو بۆ جوانی (قەڵغان)ێکی لەســـەر ڕووی ســـەرەوەی دوکانەکـــەی دانابوو (قەڵغـــان) بە زمانی ئەڵمانـــی پێی دەڵێن (ڕۆتشـــێلد) بەم شـــێوەیە ئەم ناوە بەســـەر ئەم بنەماڵەیەدا چەســـپاو تا ئێستاش بەم ناوەوە بانـــگ دەکرێن.

دەســـتەی پێنج لە چیەوە هاتووە، وەک باســـمان کرد (ئەمشەل موسا) کوڕێکی دەبێـــت بە نـــاوی (مائیر)، دواجار مائیر ئـــەم بنەماڵەیە بنیـــات دەنێت و ناوداری دەکات، (مائیـــر) پێنـــج کوڕو کچـــی دەبێت، لەســـەر پێنج کوڕەکەی (دەســـتەی پێنـــج) دروســـت دەکات و پێیان دەڵێـــت دەبێت لە ڕێـــگای ســـامانەکەمانەوە دەســـت بگرین بەســـەر هەموو ئەوروپاو جیهاندا بەم شـــێوەیە:

- ئەنسەلیم ←——— ئەڵمانیا
- سالمۆن ←——— نەمسا
- ناثان ←——— بەریتانیا
- کارل ←——— ئیتاڵیا
- جیمز ←——— فەرەنسا

دواتـــر بە کوڕەزاکەشـــی وت کە نـــاوی (بێلمونت) بوو وڵاتـــی ئەمریکا بۆتۆیە ؟! بەم شـــێوەیە ناوی دەســـتەی پێنـــج لەوەوە هاتـــووە ئەم بنەماڵـــە جولەکەیە پێکهێنـــەری ســـەرەکی گروپـــی نورانیەکانـــن، دامەزرێنەری ســـەرەکی دەوڵەتی جولەکـــەن، لە ڕێگای تۆڕە ســـیخوڕی و جاسوســـیەکانیانەوە دەســـتیان بەســـەر هەموو جومگە ســـەرەکیەکانی جیهانـــی پارە و بانکەکاندا گرتـــووە، لە هەموو ئەو جەنگانەدا هەڵدەگیرســـا لە نێـــوان وڵاتـــە ئەوروپیەکاندا ئـــەم بنەماڵەیە براوەی ســـەرەکی بوون، ئەمەش بە ســـەرقاڵ بوون بە بازرگانی چـــەک و تەقەمەنی و بە

پێدانی قــەرز بە وڵاتان و دەستخســـتنە ناو بانکەکان، و پاشـــان ئاوەدانکردنەوەی وڵاتــی دۆڕاو و هتــد.. تایبەتمەندیەکــی تری ئــەم بنەماڵەیە ئەوەیــە کە نابێت هاوســەرگیری لەگەڵ هیــچ بنەماڵەیەکی تردا بکەیت، وە هەر کەســێک پەیڕەوی ئەم یاســایەی نەکردبێت لــە میرات بێ بەشــیان کردوە؟!

ســاڵی (١٩١٧) وەزیــری دەرەوەی بەریتانیا (بلفۆڕ) نامەیەک ئاڕاســتەی (لۆرد ڕۆتشــیڵد) دەکات کە تیایــدا داوای بنیاتنانی وڵاتێک بۆ جولەکــە دەکات .. دواتر ئەمــە بە پەیماننامەی (بلفــۆر) دەناسرێت هاوکات داوای یارمەتــی لەم بنەماڵەیە کرا بۆ ئەم مەبەســتە.

لێــرەدا پێویســتە ئاماژە بــە خاڵێک بکەین ئەویــش ئەوەیە کە لە ســەرەتادا بنەماڵــەی ڕۆتشــیڵد پێیان خۆشــنەبوو دەوڵەتێکــی جولەکە دروســت بکرێت، بەڵکــو پێیان باشــبوو جولەکە لە وڵاتانی ئەوروپا باڵادەســتی خۆیان بســەلمێنێنن و بەرامبەر بە مەســیحیەت بوەســتن، بەڵام کاتێک هەســتیان بەوەکرد کە ناتوانن ئەمــە بکــەن، وە ڕاپۆرتەکەی (بازمــان) ســاڵی (١٩٠٧) ســەرۆک وەزیرانی ئەو کاتــەی بەریتانیا کە لــەم ڕاپۆرتەدا نــاوی هاتبوو کەوا پێویســت دەکات باکوری ئەفریقیــا و ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاســت لەیەک جیا بکەینــەوە، ئەمەش بەوە دەبێــت کەوا دەوڵەتێــک بۆ جولەکەکان لــەو نێوانەدا دروســت بکەین!؟

(بازمان) چیە؟ ئەو ڕاپۆرتە وردو درشــتەیە کە ســەرۆک وەزیرانی بەریتانیای ئــەوکات (بازمان) ئامادەی کرد بوو بۆ ســەرجەم ســەرۆک وڵاتانــی ئەوروپای خوێنــدەوە لە ســاڵی (١٩٠٧)ز تیایــدا زۆر بــە وردی باس لــەوە دەکات کە شارســتانیەت لە دەســتی ئەوروپادا نامێنێــت و جارێکی تر وڵاتانی ئیســلامی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســت جڵەوی پێشــکەوتن و شارســتانیەت دەگرنەوە دەست بۆیە پێویســتە لەســەرمان ئەم کارانە لــە بەرامبەریان ئەنجــام بدەین:

١- دابەش کردنیان لە ناوخۆیاندا.

٢- بە هیچ شێوەیەک تەکنۆلۆژیای نوێیان پێ نەگات.

٣- وروژاندنی دوبەرەکی و تایەفەگەری لە نێوانیاندا.

٤- چاندنــی لاشــەیەکی نامۆ کــە رۆژهەڵاتی دەریــای ناوەڕاســت و باکوری ئەفریقیــا لەیــەک جیابکاتەوە. لــەم خاڵــەی چوارەمەوە گرنگی دروســتکردن و بنیاتنانــی دەوڵەتێک بــۆ جولەکەکان هاتــە مەیدان و کاری زۆریــان بۆ کرد و لە کۆتاییدا ئــەم کارەیان بــۆ ئەنجامدا .

لیۆنێل ڕۆتشــێلد ســاڵی (١٨٦٨- ١٩٢٧)ز سەرۆکی دەســتەی جولەکەکان بوو لــە (ئینگلتــەرا) رۆڵی گەورەی هەبووە لــە هاوکاری کردن و ناردنــی جولەکەکان بۆ (فەڵەســتین)، وە'هەوڵی زۆری داوە بۆ دروســتکردنی (فەیلەقێک)ی سەربازی لــە ســوپای بەریتانیا تایبــەت بە جولەکــەکان لــە جەنگی جیهانــی یەکەم کە دواتر ئەمــە بوو بە بــەردی بناغەی ســوپای جولەکەکان.

هەروەهــا (ئەدمۆنــد ڕۆتشــێلد ســاڵی (١٨٤٥- ١٩٢٤)ز ســەرۆکی لقی فەڕەنســا بــە هەمان شــێوە رۆڵی ســەرەکی هەبوو لــە ناردنــی جولەکە بۆ فەڵەســتین، هەروەهــا یەکێــک لــە نەوەکانــی (ئەدمۆند) کە هــەر ناوی باپیــرەی هەڵگرتبــوو لە ســاڵی (١٩٦٧) گروپی هــاوکاری لەگــەڵ ئیسرائیلی دروستکردو، وە لە ســاڵانی پەنجاکان و شەستەکاندا ســەرمایەگوزاری زۆری لە ئیسرائیــل ئەنجام داوە.

کۆتــا کاری ئەم بنەماڵەیــە بریتیە لە نەهێشــتنی نەفرەت کــردن لە جولەکە لەنوێــژی مەســیحیەکاندا لە ڤاتیــکان لە ئیتاڵیــا، وە بێتاوان کردنــی جولەکە لە خوێنی مەســیح ..

بێگومــان ئەمەش رێخۆشــکەر بوو بۆ زیاتــر نزیک بوونــەوەی (جولەکەکان و مەســیحیەکان)، ئەنجامدانــی کارەکان بە هاوبەشــی !! بە وێنەی ســەر لەنوێ داگیرکردنەوەی جیهانی ئیســلامی لــە ژێر ناوی نوێ و بەهانــەی جۆراوجۆر وەک (چەکی قەدەغــە کراو، یارمەتیدانی تیرۆر، هتد ...)، وە دەســت بەســەر داگرتنی نــەوت و گازی هەمــوو جیهان، وە یــاری کردن بە بۆرســەو بانکــە جیهانیەکان هــەر کاتێک بیانەوێــت (دارمانی بانکەکانــی ولاتانی رۆژهەڵاتی ئاســیا مالیزیا و ســەنغافورە بە نمونە).

## ٨- بنەماڵەی (ئۆناسیس)ی یۆنانی:

ئــەم خانەوادەیە لە وڵاتی (یۆنان) ژیــاون و بنیاتنەری ئــەم خانەوادەیە ناوی بە (پاشــای دەریــاکان) دەرکردوە، ســەرەتای ژیانی ئەم بنەماڵە یۆنانیە لە شــاری (ئیزمیــر)ی تورکیاوە دەســت پێدەکات و ژیانێکــی مامناوەند دەژیــان لە وڵاتی تورکیــا لــە ســاڵی (١٩٠٦)ز، دوای جەنگی جیهانــی یەکەم و لە ســاڵی (١٩٢٣) دوبــارە گەڕانەوە بــۆ وڵاتی خۆیان.

لە یۆنانەوە (ســوقرات ئەرســتۆ ئوناســیس) کە بە دامەزرێنەری ئەم بنەماڵەیە دادەنرێــت بــەرەو وڵاتی ئەرجەنتیــن کۆچی کرد، لــەو کاتەدا ئەم پیــاوە تەنها خاوەنی (٦٣) دۆلار بووە !؟ دەســتی بــە کارکردن کرد لە بــواری بازرگانی توتن و کڕینی کەشــتی، لەو کاتەدا پیاوانی ماســۆنی زۆر دەست ڕۆیشــتوو و دەوڵەمەند بــوون .. ئەم پیاوەیان ناســی و هاوکاریان کــرد تا وایان لێکرد بــوو بە یەکێک لە هــەرە دەوڵەمەندەکان و خاوەنی کەشــتی گەلی تایبەت بە خــۆی بوو، چەندین کەشــتی نەوت هەڵگری هەبــوو نەوتیان دەگواســتەوە، تا وای لێهــات ناوی بە (پاشــای دەریــاکان) دەرکــرد، هــەر ئەویش لە ســاڵی (١٩٥٧) هێڵی ئاســمانی یۆنانــی بنیات نا..

بــە بەردەوامــی لەســەر بەلەمــە گەشــتیاریە بــە ناوبانگەکەی کــە ناوی (کریســتینا) بــوو دەژیا..

ئــەم پیاوە لــە ناوچــەی (ئەنــادۆڵ)ەوە خانەوادەکەیــان کۆچیــان کرد بۆ یۆنــان دوای ماوەیەک لە وڵاتــی ئەرجەنتین گیرســایەوەو بــە کاری بردنی نامە و بەرقــەوە ســەرقاڵ بوو لەوێ بووە مایەی ڕاکێشــانی ســەرنجی (ئیفــا بیرون) کــە بازرگانێکی بــە ناوبانگی توتن بــوو، لەگەڵیــدا کاری کرد تا ســاڵی (١٩٣٣) یەکەمین کەشــتی خۆی کڕی، دواتر لە ســاڵی (١٩٣٨) یەکەمین کەشــتی نەوت هەڵگــری کڕی، بیرتیــژی و زیرەکی ئەم پیــاوە زۆر لە پێــش هاوەڵەکانیەوە بوو، زوو درکــی بــە گرنگی گواســتنەوەی ناوی کرد بــە تایبەت تر لە بــواری نەوتدا، بۆ ماوەی زیاتر لە (٣٠) ســاڵ دەســتی بەســەر ئەم بوارەدا گرتبــوو تەنانەت لە


منتدى إقرأ الثقافي

کــــۆی پێنج کەشــتی نەوت یەکێکیــان هی وڵاتی یۆنـــان بوو ! بۆیـــە ناوبانگی بە پاشـــای دەریاکان دەرکردبوو..

ســـاڵی (١٩٤٨) یەکـــەم هاوســـەرگیری ئەنجامـــداوەو کوڕێکـــی بـــە نـــاوی (ئەســـکەندەر) بـــووە لە ســـاڵی (١٩٧٣) بـــە ڕوداوی فڕۆکە مردوە، کچەکەشـــی بە هـــۆی زۆر بەکارهێنانی مادە هۆشـــبەرەکانەوە ســـاڵی (١٩٨٨) مردوە، پاشـــان لـــە ســـاڵی (١٩٦٨) (جاکلین کینیدی) خێزانی ســـەرۆکی پێشـــووی ئەمریکا (جۆن کینیدی) خواســـتوەوە تـــا کۆتایی تەمەنی ســـاڵی (١٩٧٥) لە گەڵیدا ژیـــاوە... ئەم پیـــاوە بـــە یەکێک لە بـــە ناوبانگتریـــن و مەزنترین ئـــەو کەســـانە دادەنرێت لە بـــواری بازرگانی دەریایـــی و گواســـتنەوە نەوتیەکاندا مایـــەی ئیلهامی زۆر کەس بـــووە لەم بوارەدا لەوانـــە (ئیفانجلیوس) کە نازناوی باشـــترین پیاوی کاری وەرگرت لـــە یۆناندا و توانـــی لە مـــاوەی تەنها (٥) ســـاڵدا ببێتە خاونی (٥٠) کەشـــتی.

لـــە کۆتاییدا ســـامانی ئـــەم ملیاردێـــرە یۆنانیە بـــۆ یەکێک لە کچـــە زاکانی ماوەتەوە بە ناوی (ئەثینا روســـیل)ی تەمەن بیســـت ســـاڵ. لێرەوە ژیانی پاشـــای دەریـــاکان و بنیاتنەری بنەماڵەی ئۆناســـیس کـــە بنەچەیەکـــی نورانیەکانە کۆتایی د ێت .

## ٩- بنەماڵەی رۆکفیلری ئەمریکی:

ئەم بنەماڵەیـــە یەکێکە لە بنەماڵە هـــەرە دەوڵەمەندەکانی وڵاتـــی ئەمریکا و جیهان، هاوشـــانی بنەماڵەی (ڕۆتشـــیڵد)ە لە بڵاوبوونەوە و دەست بەسەرداگرتنی وڵاتـــی ئەمریکادا، یەکێکە لە باڵـــە بەهێزەکانی کۆمەڵەی نورانیـــەکان لە ئەمریکا.

دامەزرێنـــەری ئـــەم بنەماڵەیـــە پیاوێکی ئاســـایی بوو ســـەرقاڵی فرۆشـــتنی بەروبوم و کەرەســـتە کشـــتوکاڵیەکان بـــووە، لە کاتـــی جەنگی نێوخـــۆی وڵاتی ئەمریـــکادا، بـــەڵام لەنـــاکاو دەوڵەمەندی پێوە دیـــار کەوت و روی کـــردە بواری نـــەوت، کۆمپانیای (ســـتاندارد ئۆیڵ)ی لـــە ویلایەتی (ئۆهایۆ) لە ســـاڵی (١٨٧٠) ز دامەزرانـــد، بێگومـــان ئـــەم دەوڵەمەند بوونە بـــە هاوکاری دارایی و پاڵپشـــتی

منتدى إقرأ الثقافي

بنەماڵەی (ڕوتشـــیڵد) و هـــاوکاری و ڕێنمایـــی کۆمەڵـــەی نورانیەکاندا بووە.

یەکێک لـــە ناوە دیارەکانیـــان لە بواری سیاســـی و ســـەرمایەگوزاریدا (دایڤید ڕۆکفیلـــر)ە کە لە نێـــوان ســـاڵەکانی (١٩٤٦- ١٩٥٣)ز ســـەرۆکی پەیوەندییەکانی دەرەوەی وڵاتـــی ئەمریـــکا بـــووە، ناوبراو لـــە هەمـــان کاتدا بەرپرســـی بانکی (شـــایزمنهاتن)بووە، ئـــەم بانکە لـــە دوای جەنگـــی جیهانی دووەم راســـپێردرا بە ئامادەکردنی پرۆژەی (مارشـــاڵ) بۆ ســـەر لەنـــوێ بنیاتنانەوەی وڵاتانـــی ئەوروپا، ناوبراو دەســـتەیەکی ســـێ کەســـی دامەزرلندبوو بۆ هاوکاریکردنـــی جولەکەی بە ناوبانگ (هنری کیســـنجەر) وەزیری دەرەوەی پێشـــووی ئەمریکا، و (برزیرینسکی) مامۆســـتا لـــە زانکـــۆی کۆڵۆمبیا و خاوەنـــی کتێبی (لـــە نێـــوان دوو نەوەدا)لەم کتیبەدا بـــاس لە ڕۆڵی وڵاتـــی ئەمریکا دەکات لە ســـەدەی تەکنۆلۆژیـــای نوێدا، بێگومـــان بۆچـــوون و تێڕوانینەکانی ئەم کتێبە بـــە دامەزرێنـــەر و ڕەنگدانەوەی تـــەواوی ڕوانگەو بۆچوونـــی کۆمەڵەی نورانیـــەکان دادەنرێت.

(برزیرینســـکی) ڕاوێژکاری ئاسایشـــی نیشـــتیمانی ئەمریکا بوو لە ســـەردەمی ســـەرۆک (جیمـــی کارتـــەر)دا، بنەماڵـــەی (ڕۆکفیلـــر) یەکێکن لـــەو بنەماڵانەی کـــە ڕۆڵـــی تەواویان هەیە لە هەڵبژاردن و دەســـت نیشـــانکردنی ســـەرۆکەکانی ئەمریـــکادا لە ڕێـــگای ئەو ڕێکخـــراوەو دامەزراوانـــەی هەیانە!؟

دامەزرێنـــەی بنەماڵەی رۆکفیلر لە ســـاڵی (١٩٢٧)ز کۆچی دوایـــی کرد، دوای ئـــەوەی لە ڕێـــگای کۆمپانیـــا نەوتیەکەیەوە بە ناوی (ســـتاندارد ئۆیڵ) دەســـتی گرت بەســـەر بواری نەوتـــدا لە وڵاتـــی ئەمریکا.

لە بواری سیاســـیدا زۆر کەســـایەتی بە ناوبانگیان هەبـــووە، خودی(ڕۆکفیلر) خۆی یەکێک بووە لەو کەســـە بەناوبانگانە لە ســـەردەمی ســـەرۆکایەتی سەرۆک (ئایـــزن هاوەر)دا پۆســـتی یارمەتیدەری تایبـــەت بۆ کاروبـــاری دەرەوەی پێدراوە، ســـاڵی (١٩٧٤) پۆســـتی جێگری ســـەرۆک (فۆرد)ی بـــە دەســـتهێناوە. هەروەها یەکێکـــی تر لەو پیاوانـــە (دەیڤید ڕۆکفیلر) بووە کە لە ســـاڵی (١٩٥٠)ز پۆســـتی جێگری ســـەرۆکی پەیوەندیەکانـــی دەرەوەی وڵاتی ئەمریکای پێـــدراوە، ئەم پیاوە

به ناوبانگـــه زۆر ناودارو سیاســـی بووه زۆربەی ســـەرۆک و کەســـە ناودارەکانی جیهانی بینیوە، لە ســـەروی پۆســـتەکەی خۆیەوە هەڵســـوکەوتی دەکرد و زۆر کات ئـــەم نوێنەرایەتی وڵاتی ئەمریـــکای دەکرد؟! بێگومان ئەمەش بە هۆی پشـــتگیری کۆمەڵـــەی نورانیەکانەوە بووە ..

**١٠- بنەماڵەی کینیدی (خانەوادە داماوەکە):**

ئـــەم بنەماڵەیە لە بنەچـــەدا خانەوادەیەکی ئێرلەندین و کاســـۆلیک مەزهەبن کۆچیـــان بەرەو وڵاتـــی ئەمریکا کردوە لەوێ نیشـــتەجێ بوون، ســـەرەتا (باتریک کینیـــدی) دێتـــە وڵاتـــی ئەمریـــکاو لەگەڵ (مـــاری هیکـــی) ژیانی هاوســـەری پێکدەهێنێت، ئەم پیاوە کەســـێتیەکی سیاســـی بووە و ئەندامی پارتی دیموکراتەکان بـــووە، کوڕێکیان دەبێـــت بە ناوی (جۆزێـــف پاتریک) لە ســـاڵی (١٩١٤)ز لەگەڵ (ڕۆز فتـــز جیواڵـــد) هاوســـەرگیری دەکات و دەبن بە خاوەنـــی (نۆ) منداڵ.

ســـەرەتا یەکێک لە کوڕەکانی بە نـــاوی (جۆنیۆر) لە دایکبووی ســـاڵی (١٩١٥) ز لە ســـاڵی (١٩٤٤)ز لـــە کردەیەکی ســـەربازیدا کە فڕۆکەوان بـــووە، فڕۆکەکەی دەکەوێتە خـــوارەوە دەمرێت !!

لێرەوە کارەســـاتی کوشـــتن و لەناوبردنی یەک لـــە دوای یەکی کەســـە ناودار و بـــە ناوبانگەکانی ئەم بنەماڵەیە دەســـت پێدەکات. لە ســـاڵی (١٩٦٣) ســـەرۆک (جـــۆن کینیدی) تیـــرۆر دەکرێت لە ڕوداوێکـــی تەم و مژاویدا، کەســـێک بە ناوی (ئۆزواڵـــد) تاونبار دەکرێت بـــەم کوشـــتنە، دوای دوو ڕۆژ دەکوژرێتەوە لە لایەن (جایکـــۆب) ناوێکـــەوە ....، دواتـــر (جایکـــۆب) دەخرێتە بەندیخانـــەو ئەویش لە ڕوداوێکی گوماناویـــدا دەکوژرێت ...

(کاثلـــین کینیدی) بـــە ڕووداوی کەوتنە خـــوارەوەی فڕۆکە لە وڵاتی فەڕەنســـا تیرۆر دەکرێت...

(ڕۆبێرت کینیـــدی) لە کاتی کێبڕکێ لـــە هەڵبژاردنی ســـەرۆکایەتی ئەمریکادا، لـــە کاتێکدا لە ئەگـــەری بردنەوەدا بوو بە هەمان شـــێوە تیـــرۆر دەکرێت ..

منتدى إقرأ الثقافي

بەم شـێوەیە ئەم خێزانـە رووبـەڕووی تیرۆر کـردن و کوشـتن بوونەتەوە، سـەرەتا هەر دوو بـرا (جۆن کینیدی و ڕۆبێـرت کینیدی) تیرۆر دەکرێن، پاشـان تیرۆر کردنی چوار کەسـی تر لـەم خانەوادەیە بە رووداوی تـەم و مژاوی کەوتنە خـوارەوەی فڕۆکە بـە ناوەکانـی (جۆجۆنیۆر، کاثلـین، ئیدوارد، جـان کینیدی). جۆنیۆر کوڕی سـەرۆک کینیـدی بووە ؟!

کەسـێکی تر لەم بنەماڵەیە بـە ناوی (جۆزێـف کینیدی) نوێنـەری ئەمریکا بووە لە وڵاتی بەریتانیـا، پەیوەندیەکی زۆر توندو تۆڵی هەبـووە لەگەڵ (هیتلەر) سـەرۆکی نازی ئەڵمانیا، هەر بە سـەرکەوتنی (چەرچڵ) بۆ سـەرۆکایەتی بەریتانیا راسـتەوخۆ لە بەریتانیا دەرکرا.

ئـەم بنەماڵەیە کاسـۆلیک مەزهەب بوونـە و پەیوەندیان لەگـەڵ نورانیەکان هەبـووە... بـەڵام لەبەرئـەوەی ئەمریـکا پرۆتسـتنات مەزهەب بـووە هەموو بەرپرسـیارێتی و ئەرکێکیان بـۆ خۆیان قۆرخ دەکرد لەگـەڵ کۆمەڵەی نورانیەکان، بە هیچ شـێوەیەک نەیان هێشـتووە یەک کەس لەم بنەماڵەیە بگاتە سەرۆکایەتی و فەرمانڕەوایەتـی وڵاتی ئەمریکا، هەر ئەوەندە کە هەسـت کرابێت کەسـێکیان بـەرەو ناوداری و جیهانی سیاسـەت دەڕوات تیرۆر کراوە .. تەنها سـەرۆک (جۆن کینیـدی) نەبێـت کە بۆ ماوەیەک لەسـەر کورسـی دەسـەڵات مایـەوە، بەڵام دواجار وەکو باسـمان کرد ئەویش تیرۆر کـرا ... مێژووی ئەم بنەماڵە کاسـۆلیکیە زۆر بە نادیـاری ماوەتەوە.

ئەم بنەماڵەیـە (بنەماڵەی کینیـدی) زۆر بە ناوبانگ بوون لـە بازرگانی کردن لـە بـواری خواردنـەوە کهولیەکانـدا و زۆر دەوڵەمەند بوون، باوکیـان زنجیرەی دوانزەهەمینـی پێدرابوو لە ریزی هـەرە دەوڵەمەندەکانـی وڵاتی ئەمریکا.

(جۆزێـف کینیـدی) باوکیـان زۆر هەوڵـی دەدا بنەچـە ئێرلەندییەکەیان و مەزهەبـە کاسـۆلیکیەکەیان بشـارێتەوە بـەڵام سـودی نەبوو. بۆیـە لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنی سـەرۆکایەتی (جۆن کینیدی)دا ناسـنامە کاسـۆلیکیەکەی بـوو بوو بـە گرفت و مایـەی دڵەڕاوکێ لـە نـاو دەنگدەرانیـدا، نەیارەکانی بە

توانجــەوە دەیــان ووت لەمــەولا (ڤاتیکان) وڵاتــی (ئەمریکا) بەڕێــوە دەبات.

لێــرەوە ســەرۆک کینیــدی لــە کاتــی ســەرکەوتنیدا وتــی من بــاوەڕم بە ئەمریکایــەک هەیــە کە هیــچ ئایــن و مەزهەبێک باڵادەســت نەبێــت تیایدا و خەڵکــی ئــازاد بــن چ ئایــن و مەزهەبێکیان هەبێــت. وە مــن دژایەتی خۆم دەردەبڕم بــۆ هەر کەســێک هــەر دام و دەزگایەکی دەوڵــەت بەکاربهێنێت بۆ باڵادەســتی کاســۆلیک یان پرۆتســتانتەکان، وە من هەڵبژێردراوی کاسۆلیکیەکان نیم بۆ پۆســتی ســەرۆکایەتی، بەڵکو قــەدەر وایکردوە کە من کاســۆلیک بم و لە هەڵبژاردنەکاندا ســەرکەوتن بەدەســتبهێنم.



منتدى إقرأ الثقافي

## سەرانی ماسۆنیەت و نورانییەکان

- دەستەی سیانیی و ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە، ئەمریکا و جیهان بەڕێوەدەبەن.
- (بیلدربرگ) کۆمەڵەی سەرۆك و سەرکردەکان گەورەکان.
- هەوڵدان بۆ بنیاتنانی فەرمانڕەوایەتیەکی جیهانی لەڕێگای بەرپاکردن و بڵاوەپێکردنی پشێوی و ناجێگیری سیاسی لە جیهاندا.
- کۆمەڵەی کاسەسەر و ئێسقان و دەستەسڕ و کلیل و دروستکردنی چەندین سەرکردە و سەرۆك.
- سەرانی یەکەمینەکانی نورانیەکان و ماسۆنییەکان لە بەڕێوەبردنی ئەمریکادا.
- وێنەی ماسۆنی لەسەر دراوی یەك دۆلاری ئەمریکی.




منتدى إقرأ الثقافي

## دەستەی سیانیی و ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە فەرمان ڕەوایی وولاتی ئەمریکا و جیهان دەکەن

وویلایەتــە یەکگرتووەکانــی ئەمریــکا یەکێکــە لــە وڵاتــە هــەرە زلهێز و مەزنەکانــی جیهان،هــەر یەکێــك بــوو بــە فەرمانڕەوا و ســەرۆکی ئــەو وڵاتە بــە گوزارشــتێکی تــر دەبێت بــە ســەرۆکی هەمــوو جیهــان، ڕێکخراوەکانی (نورانیــەکان و ماســۆنیەکان) ی بــە شــێوەیەکی نموونەیی وولاتــی ئەمریکایان بوونیادنــاوە ئەمــەش بۆ دروســتکردنی یەك حکومەتــی فەرمانڕەوا لــە جیهان، لێــرەوە هەر ســەرۆکێکی وڵاتی ئەمریکا کە دەگاتە کۆشــکی ســپی سیاســەتی پێــش وەختــەی ماســۆنیەت جێبەجــێ دەکات. ماســۆنییەکان و نورانییەکان لە ڕێگــەی چەند دەســتەو ڕێکخراوێکی نهێنی یــان نیمچە نهێنی یــەوە ئهم کارانە دەکــەن، نموونەی ئــەو ڕێکخراوانەش:

### دەستەی سیانی و ئەنجومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە (C.F.R)

دەســتەی ســیانی وەکــو پەیمانگایــەك وایە هەرچــی ســەرۆکی ئەمریکایە دەبێــت دەرچــووی ئێرە بێــت، تەنانــەت فەرمانبەرەکانی ناو کۆشــکی ســپی دەبێــت ئەندام بــن لەم دەســتەیە؟!!

ســەرۆکەکانی (ڕۆناڵد ڕیگان و کلینتۆن و بۆشــی باوك و کوڕ ســەرجەمیان ئەنــدام بوون لەم دەســتەیە.....) ئەم ســێ کۆمەڵەیە (دەســتەی ســیانی و ئەنجوومەنــی پەیوەندییەکانــی دەرەوە و لیژنــەی بیلدربــرگ ) فەرمانڕەوای ڕاســتەقینەی وڵاتــی ئەمریــکان، لــە گرنگترین کارەکانیشــیان یەکخســتنی سیاســەتەکانی ئەمریــکا و یابــان و ئەوروپــای ڕۆژئاوایــە!!. بیرۆکــەی دامەزراندنــی ئەم دەســتەیە دەگەڕێتــەوە بــۆ بیرۆکەکانی(بیرزینســکی) مامۆســتای زانکــۆی کۆڵۆمبیایــە و بەڕەچەڵەك ڕووســییە، ئــەم بیرمەندە دیــدگای وابــوو کە دەبێــت هــاوکاری و پەیوەنــدی توند و تۆڵ لــە نێوان هەرســێ کیشــوەری: ئەوروپا و ئاســیا و ئەمریــکا هەبێت. بانگەشــەی بۆ دروســتکردنی کۆمەڵگەیەکــی نــوێ و پێشــکەوتوو دەکــرد لە نێــوان ئەم

ســێ کیشــوەرەدا، پاشــان کتێبێکی چاپکرد بە ناونیشــانی: (لــە نێوان دوو ســەدەدا ) باســی ڕۆڵی ئەمریــکای دەکــرد لــە ســەردەمی تەکنەلۆجیای ئەلیکترۆنیــدا.

دواتــر توانــی (دیفیــد ڕۆکفیلــر) ی گــەورە دەوڵەمەنــد و پیــاوی نورانیــەکان ڕازی بــکات بۆ ئەم مەبەســتە، لــە کۆتاییدا لە ســاڵی ١٩٧٢ لــە یەکێك لــە باخەکانــی ڕۆکفیلر٠لە شــاری نیویــۆرك بــە ئامادەبوونی کۆمەڵێــك لە پیاوانــی نورانیەکان لە هەرســێ کیشــوەرەکە بڕیار لەســەر دامەزراندنــی ئــەم دەســتەیە درا. بــە دیاریکــراوی (٣٠٠) ســێ ســەد ئەندامیــان هەیــە، لە کەســە ناودارەکانیــان ئەمانــەن (جیمــی کارتەر، ڕۆکفیلــر، بریزینســکی، جیوفانــی ســەرۆکی کۆمپانیــای دروســتکردنی ئۆتۆمبیلی فیاتی فەڕەنســی، ئاغنیلی جێگری ســەرۆکی فەڕەنســا، فرانسوا دوتشــینی- یابــان، ئۆســابوروا یەکیتاکیتش میــازا، تاداشــی یاماموتو). ئەم دەســتەیە ســێ بنکەی ســەرەکی لەهەرســی شــارەکانی نیویۆرك و تۆکیۆ و پاریــس هەیــە، لیژنــەی بەڕێوەبردنــی پێکدێــت لــە ٣٥ ئەنــدام، نۆ مانــگ جارێك دانیشــتن ئەنجــام دەدەن و هەرجــارەی لە یەکێك لە ســێ شــارەکە (نیویــۆرك و تۆکیــۆ و پاریس)، لــە ڕووی دابینکردنــی داراییەوە هەریەکــە لــە کۆمپانیاکانــی (ماڕشــاڵ ی ئەڵمانــی و فــۆرد و جەنەڕاڵ مۆتــۆرز، برایانــی ڕۆکفیلــر ی ئەمریکی) بەرپرســی دابینکردنی ســامان و دارایــی ئــەم ڕێکخراوەن بۆ بــە ئەنجــام گەیاندنی کارەکانیان ســەرەتا لە ڕێگەی ڕاگەیانــدن و بڵاوکراوەکانیانــەوە کاری تەواوی بــۆ دەکەن تا وەکو لەلای هــەوادار و خەڵکی ئاســایی ببێتەوە، لــە ئامانجە ئاشــکراکانیان کە بە ئاشــکرا بانگەشــەی بۆ دەکەن، پێگەیاندن و دروســتکردنی ســەرکردەی لێهاتــووە بۆ ســەرۆکایەتی وولاتی ئەمریــکا و لەو ڕێگەیەوە دروســتکردنی سیســتەمێکی یەك فەرمانڕەوایی جیهانی و دەســت بەســەرداگرتنی جیهان لــە ڕووی ئابووری و ســەربازییەوە؟؟!

**ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە:**

ئەم دەستەیە دەستەیەکی ئەمریکییە، ئەندامانی ئەم دەستەیە پێکدێن لەو سەرۆك وڵاتانەی دۆستی وڵاتی ئەمریکان و ئەو کەسە پارێزگارە نوێیانەی کە پەیوەندییان بە ڕێکخراو و یانە ماسۆنی و جوولەکەکانەوە هەیە. ئەندام لەم ڕێکخراوە دەبێت هەڵگری ڕەگەزنامەی وڵاتی ئەمریکا بێت، یان مانەوەی هەتاهەتایی هەبێت.

هەرکەسێك پاڵێوراوبێت بۆ ئەندامێتی لەم ڕێکخراوە، دەبێت وتارێکی (٥٠٠) ووشەیی پێشکەش بکات لەبەرامبەر ئەنجوومەن، دەبێت لێهاتووی و شارەزایی خۆی لە دووتوێ ی ئەو ٥٠٠ ووشەیەدا نیشان بدات ئەگەر وەڵامی نەخێری وەرگرت دەتوانێت ٣ ساڵی تر داواکاری پێشکەش بکاتەوە.

سەرانی ئەم ئەنجوومەنە سەرکردە و پیاوە گەورەکانی ماسۆنیەتی جیهانین کە بە نهێنی فەرمانڕەوایی جیهان دەکەن و کار بۆ دروستکردنی سیستەمێکی جیهانی نوێ دەکەن، کورتکراوەی ناوی ئەم ئەنجوومەنە (.C.F.R)ە واتە (Council on Foreign Relations) بەرپرسن لە دەرچواندن و دروستکردنی سەرکردەکانی وڵاتی ئەمریکا لەسەرجەم بوارەکاندا (ئابووری، ڕامیاری، کارگێری،... هتد). کاری سەیر و سەمەرەیان ئەنجام داوە، لەوانە یارمەتیدانی هیتلەر و نازییەکان لە سەرەتای جەنگی جیهانی دووەم؟؟؟.

زۆرجار بەم ئەنجوومەنە دەوترا (ئەنجوومەنی ڕۆکفیلر)[٩].

یەکێکی تر لە کارە دیارەکانی ئەم ئەنجوومەنە لەکاتی هاتنە سەرکاری هەر سەرۆکێکی وڵاتی ئەمریکادا بە مەرج لەسەریان دادەنا کە (٤٠-٦٠) پیاو لەو ناوانەی کە ئەنجوومەن دەست نیشانی دەکات، دەبێت لە دام و دەزگای سەرۆکایەتی دابمەزرێندرێن.

بەم شێوەیە دەبینین لە زۆربەی دام و دەزگا هەستیارەکانی وڵاتی ئەمریکا ڕێژەیان بەم جۆرە بووە:

---

٩ (١) ڕۆکفیلر: ملیۆنێر و گەورە پیاوی نورانی و ماسۆنییەکانە.

١. وەزارەتـــی دارایی لەســاڵی ١٩٢١ لە کــۆی (١٨) وەزیر، (١٢) یـــان ئەندام بوون لـــە (C.R.F).[١٠]

٢. وەزارەتـــی دەرەوە لـــە ســاڵی ١٩٢١ هوە لە کــۆی(١٦) وەزیـــر، (١٢) یان ئەنـــدام بوون لـــە (C.R.F).

٣. وەزارەتـــی بەرگـــری لەســاڵی ١٩٤٧ هوە لەکــۆی (١٥) وەزیـــر، (١٢) یان ئەنـــدام بوون لـــە (C.R.F)ز

٤. دەزگای هەواڵگـــری ناوەندی لەســاڵی ١٩٤٧ هوە لەکــۆی (١١) بەڕێوبەر، (٧) یان ئەندام بـــوون لە (C.R.F).

هەمـــوو ئـــەم زانیاریانە و زیاتر لـــە کتێبـــی (بەڵگەنامـــە)ی د. جیمس دبلیو واردنـــر دا دەبینرێت.

هـــاوکات توانیویانـــە لـــە ســـەرجەم دەزگا و ڕۆژنامـــە و گۆڤـــار و کەناڵـــە ڕاگەیاندنەکانـــەوە درێـــژە بـــە جێبەجێکردنـــی پلانەکانیان بدەن لـــە فریودان و چەواشـــەکردنی هاوڵاتیانـــی ئەمریـــکا، لـــەو دەزگایانەش:

١. کەناڵە جیهانییەکانی وەك (CBS، ABC، NBC......).

٢. ڕۆژنامـــەکان وەك (نیویۆرك تایمز، واشـــنتن پۆســـت، لـــۆس ئەنجلۆس تایم، شیکاگۆ ســـان، وۆڵ ســـتریت. نیوزیك، بزنس ویك).

لەســاڵی ١٩٩١ز لـــە شـــاری (Bilderberger) ئەڵمانیـــا (دیڤیـــد ڕۆکفیلـــر) بەڕێوبـــەری (C.F.R) وە بـــە ئامادەبوونـــی بەڕێوبـــەری ســـەرجەم ئـــەو دەزگا ڕاگەیاندنانـــە بە ئاشـــکرا وتـــی: ئێمـــە زۆر سوپاســـیان دەکەین کـــە توانییان بۆ مـــاوەی (٤٠) ســـاڵ نەخشـــە و پلانەکانـــی ئێمە بـــە نهێنی جێبەجـــێ بکەن؟؟ نەخشـــە و پلانەکـــەش ئەوەیـــە کارکردنـــی بـــەردەوام بـــۆ دروســـتکردنی یەك حکومەتـــی جیهانـــی کـــە زیاتـــر مەبەســـتیان فەرمانڕەوایەتییەکی خۆســـەپێنی و دیکتاتۆرییە بە ســـەرۆکایەتی (میســـح ی دەجال)[١١]... لـــە کتێبی(دیکتاتۆریەتی

---

١٠ ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە.

١١ لە لای جوولەکە هەروەك لە پرۆتۆکۆلەکانیاندا هاتووە، هەتا ئاژاوە و کوشتن و برین زیاتر

دیموکراســـی) ئارثر میلـــر دەڵێت: ئێمە پێویســـتە سیســـتەمێکی دەرەبەگایەتی و دیکتاتۆریەتی دەســـتەبژێر دروســـت بکەینـــەوە... بۆ ڕێگەخۆشـــکردن بۆ هاتنی پیـــاوە چاوەڕوانکراوەکـــە!؟ مەبەســـت لێـــێ دەجاله.

لێـــرەوە دەبینین دەســـتەی ســـیانی و C.F.R و بیروبۆچوونەکانی برزینســـکی و ڕۆکفیلـــر لـــە دانیشـــتنە نهێنییەکانیاندا هیچ ناخۆشـــحاڵی و یان سەرزەنشـــت کردنیـــان نەبووە بـــۆ کوشتارەکانی(ســـتالین، مـــاو، هیتلـــەر ) و وێرانکارییەکانی هـــەردوو جەنگـــە گەورەکە؟؟ بەڵکـــو هاوکاری و ڕێنماییشـــیان هەبـــووە بۆیان، نموونەش لە ســـەرەتای جەنگی جیهانـــی دووەم نورانیەکان لـــە وولاتی ئەمریکاوە هاوکاری هیتلەریـــان دەکرد و کەســـەکانیش ناسراوبـــوون.... دوای کۆتایی هاتنی جەنـــگ بە ڕووکەشـــی دادگایی کـــران و بێتـــاوان دەرچوون!؟.

یەکێکـــی تر لـــە کارەکانیـــان بریتیە لـــە هەوڵدان بـــۆ کەم کردنـــەوەی ڕێژەی دانیشـــتوانی ســـەر زەوی ئەمـــەش لە ڕێـــگای پەراوێـــزی دانیشـــتنەکانی نەتەوە یەکگرتـــووەکان و ڕێکخراوەکانـــی ئافرەتان و منداڵانی جیهانییەوە.... پیلانەکەشـــیان بەم شـــێوەیە یـــە لـــە وولاتـــە هـــەژار و دواکەوتووەکانـــەوە دەســـت پێدەکەن بـــە پێدانی یارمەتـــی دارایی و هـــاوکاری منـــداڵان و ئافرەتان......هتـــد لە ڕێگەی بەرنامەڕێـــژی بەکـــی وورد و درێژخایەنـــەوە، لەبەرامبەریشـــدا دەبێـــت وولاتـــی ناوبـــراو لەڕێـــگای دام و دەزگاکانیـــەوە بانگەشـــە بـــۆ (کەمکردنـــەوەی وەچـــە، لەباربردنـــی منداڵان) بـــکات، ئەگەر وانـــەکات لـــەو یارمەتییە داراییانە بێبەشـــی دەکەن تەنانـــەت زۆرجار قـــەرزە نێودەوڵەتییەکانیش کە وولاتێـــك وەری دەگرێت لـــە (بانکـــی نێودەوڵەتـــی و دراوی نێودەوڵەتـــی ) ئـــەم مەرجانـــەی لەگەڵدایە...

لە کتێبی (جیهان بەبێ ســـنوور) (World without borders) لە ســـاڵی ١٩٧٢ لیســـتەر براون[١٢] دەڵێت: ئێمە پێویســـتمان بە سیســـتەمێکی جیهانـــی نوێ هەیە،

---

بڵاوببێتەوە، ڕێخۆشکەرە بۆ هاتنی (دەجال) و ڕزگاربوونیان . هەرسێ ئاینەکە (جوولەکە و مەسیحییت و ئیسلام) ئاماژە بە هاتنی فریادرەسێك دەکەن لەکاتی تێکچوونی جیهان و بڵاوبوونەوەی شەڕ و ئاژاوە.

١٢ ئەندام لە ئەنجوومەنی دەرەوە(C.F.R).

منتدى إقرأ الثقافي

وولاتان دەبێت بچنە سەرووی ئینتیما بۆ نیشتیمان و نەتەوە.... دەبێت سەرلەنوێ سامانی جیهان دابەش بکرێتەوە.... دەبێت دیکتاتۆرییانە جیهان بکەین بەیەك کۆمەڵگە و بەڕێوەی ببەین. بە گوێرەی نووسراوە کۆنەکانی جوولەکەکان باوەڕی پتەویان وایە کە هاتن و پەیدابوونی (دەجال) کاتێك دەبێت کە لەسەر زەوی شەڕ و شۆڕ و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و هەژاری و ململانێی نێوان نەتەوەکان ڕووبدات، هەموو ئەم کێشە و گرفتانە دەبنە پێشهات بۆ لەدایکبوون و پەیدابوونی (دەجال)، لێرەوە جوولەکەکان لە ڕێگای نورانیەکان و ماسۆنییەکان و دەستەی سیانی و ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە کاری زۆر ترسناك دەکەن وەك بڵاوەپێکردنی هەندێ جۆر لە بەکتریا و ڤایرۆسە ترسناکەکان کە لە تاقیگەکانیاندا تا ئێستا پاراستوویانە بۆ بڵاوبوونەوەی چەندین جۆری نەخۆشی ترسناك[١٣].

کارئاسانی کردن بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی گەورە، دواتر کپ نەکردنەوەی ئەو جەنگانە و درێژەپێدانی کێشەکانی (گەلانی عێراق، سوریا، یەمەن، ئەفغانستان) باشترین نموونەن، چارەسەرنەکردن و بنەبڕنەکردنی کێشەی ئێران، سیاسەتی بەدەمەوەگرتن و بەڕێوەبردنی کێشەکان نەك چارەسەرکردن و بنەبڕکردنی، بەبێ گوێ دانە هاووڵاتییان و دانیشتوانی ئەو ناوچانە کە بە هەزارەها کەس کوژراون و چەندین ملیۆن کەس ئاوارەی وولاتان بوون ئەوەشی ماوەتەوە لەناو ئەو وولاتە پڕ ئاژاوە و شەڕ و شۆڕانەدا ئەوەیە بە دەستی چەندین جۆر نەخۆشی و کەمی ئاوی خواردنەوە و برسێتی و نەخوێندەواری و هتد.... دەناڵێنین.... زۆر بە ووردی کار بۆ کەمکردنەوەی دانیشتوانی سەر زەوی دەکەن.

---

١٣ (٢) بڵاوەپێکردنی چەندین جۆر ڤایرۆسی کوشندە و مەترسیدار لەم چەند دەیەی ڕابردوودا، وەك ڤایرۆسی ئیبۆلا، ئەنفلۆنزای بەراز، ئەنفلۆنزای باڵندە، سارس و هتد.... مەترسیەکەش لەوەدایە لە ڕێگای چەند کۆمپانیایەکی فیلم سازەوە وەکو (هۆلیود) کار دەکەن بۆ ئاسایی بوونەوەی بڵاوبوونەوەی ئەو ڤایرۆس و نەخۆشییانە لە وولاتە جۆرا و جۆرەکان، نموونە: تەنها لە هۆلیود لەساڵی ١٩٨٠ وە تا ئێستا چەندین فیلم لەسەر بڵاوبوونەوەی ڤایرۆس دەرهێنراوە. (وەرگێر) سەرچاوە (Google search).


منتدى إقرأ الثقافي



## کۆمەڵەی کاسە سەر و ئێسقان
## (دەرچواندنی سەرۆك سەرکردەکان)

**کۆمەڵەی کاسە سەر و ئێسقان**

لــە کاتێکــدا نورانیەکان شــوێنە ســەرەکیەکەی خۆیــان لە وولاتــی ئەڵمانیا گواســتەوە بۆ وولاتــی ئەمریکا، ڕاســتەوخۆ لە نێــو چینی گەنجاندا دەســتیان بــە کارکردن کرد بۆ شــیاندن و دروســت کردنــی کۆمەڵێ ســەرکردەی دوارِۆژ و دواجــار ببنە ئەندام لــە ڕێکخراوی ماســۆنیەتی جیهانی، دەگەڕان بــە دوای ئەو لاوانــەی کە جوولەکە بــوون و کاریان لەســەر دەکــردن و ڕێکخــراوی نهێنیان لێ دروســت دەکــردن. چاویان لەســەر یەکێك لــە خوێندکارەکانــی زانکۆ بوو بەنــاوی (ولیــام.هـ. ڕاســڵ) ناوبراو لــە خانەوادەیەکــی جوولەکە بــوو، وە زۆر دەوڵەمەندبــوون، لەســاڵی ١٨٣٣ز بە مەبەســتی خوێنــدن ناردیان بــۆ وولاتی ئەڵمانیــا (ئەڵمانیــای دایکــی نورانیــەکان وماســۆنیەت) لــەوێ پەیوەندی کرد بــە ڕێکخراوێکی ماســۆنی نهێنی یــەوە، ئەم ڕێکخراوە دروشــمە کــە یان مردن بــووە؟؟ کە گەڕایــەوە بۆ ئەمریــکا ڕێکخــراوی (برایانی مردن)ی دروســت کرد،

دواتــر ناوەکەی گــۆڕی و کردی بە (ڕێکخراوی کاسەســەر و ئێســقان) لە زانکۆی (بیــل) بە نهێنی بــارەگای بۆدانــا، ژمارەیەکــی دیاریکراو پەیوەنــدی پێوەکردن بۆ بــوون بە ســەرکردەی دوارۆژ.......

دروشــمی ئــەم کۆمەڵەیــە دوو ئێســکی قاچە بە شــێوەی لێکــدان، وە لە سەرووشــیانەوە کاســە ســەرێکە وە لە خــوارەوەی دروشــمەکە ســاڵی (٣٢٢ پ.ز) نووسراوە کە گوزارشــتە لــە ســەردەمی ئیغریقەکان، لەســاڵی (١٨٣٢) لە سەردەســتی ماســۆن لە ئەڵمانیا دروســت بووە، پاشــان هاتنە وولاتی ئەمریکا و ئەویٚ بوو بە نیشــتیمانی ســەرەکییان لەساڵی ١٨٨٢، ئامانجی ســەرەکیان دەست گرتنە بەســەر جڵەوی هەموو جیهاندا و دروســت کردنی فەرمــان ڕەوایەتییەکی نهێنــی جیهانییــە لەســەرووی وولات و ســنور و نەتــەوە وە.....؟؟ ئەمریکیەکان دان بــەوەدا دەنێــن کــە ئەندامانی ئــەم ڕێکخــراوە نهێنی یە گەیشــتوونەتە زۆربەی شــوێن و پلــەو پایــەکان لە وولاتەکــەدا، یەکێــك لــەو خانەوادانەی کــە زۆر بەتاســەوە دوای ئــەم ڕێکخراوە کەوتوون (خانەوادەی بۆشــە) بۆشــی باوك و بۆشــی کــوڕ، باپیــرە، مامەکانیــان، خاڵەکانیــان هەمــوو ئەندامن لەم ڕێکخراوە، لە هەڵبژاردنەکانی ســەرۆکایەتی ســاڵی ٢٠٠٤ دا هــەردوو بەربژێری دیموکراتەکان (جــۆن کێری) ئەندام لــە ڕێکخراوەکە لەســاڵی ١٩٦٦ز، بەربژێری کۆمارییــەکان (بۆش) ئەنــدام لە ڕێکخراوەکە لەســاڵی ١٩٦٨ز، لــە وتارەکانیاندا دانیــان بەوەدانا کــە ئەندامن لــەم ڕێکخراوەدا. ســاڵانە لەکــۆی (٨١١) ئەندام (١٥) ئەنــدام هەڵدەبژێردرێــن بــۆ ئەندامێتــی هەتاهەتایــی. لــە ســەرەتادا پرۆتســتانت مەزهەبەکانیــان بــۆ ئەندامێتی هەڵدەبــژارد، بەڵام لەســاڵی ١٩٩٢ هوە و لەســەردەمی (بــۆش) ی باوکەوە دەســتیان کرد بە وەرگرتنــی کاثۆلیك بە ســپی پێســت و ڕەش پێســتەکانەوە، هاوکات جوولەکەشــیان وەردەگرت.

نزیکەی بیســت و چوار خانــەوادەی ئەندام لەم ڕێکخراوە دەســتیان گرتووە بەســەر ســەرجەم جومگەکانی دەســەڵات لەم وولاتــەدا و لــەو خانەوادانەش (خانەوادەکانــی بۆش، هارمــان، ڕۆکفیلــر). کەناڵی (فۆکس نیــوس)ی ئەمریکی

لــە ١٤-٤-٢٠٠٢دا فیلمێکــی بەڵگەیی بڵاوکردەوە کە زۆر بــە نهێنی وێنە گیرابوو، تێیــدا کۆمەڵــێ ئەندام لەم ڕێکخــراوە لە بارەگای ســەرەکی کە پێــێ دەوترێت (گــۆڕ) قەبر ڕێوڕەســمێکی زۆر ســەیر و نامــۆ بەڕێوەدەبــەن؟؟ ئافرەتێك ملی یەکێك بــە چەقۆ دەبڕێــت و هەموو بە دەوریــدا سروودی تایبەتــی دەڵێنەوە، کاسەســەرێ دێنن یــادەوەری ناوبــراوی تێدایە ئــەو کاتەی خوێنــدکار بووە لە زانکــۆی (بیل) و دەســت دەکەن بــە ماچکردنــی کاسەســەرەکە. هەروەها لە ڕێوڕەســمی بــوون بە ئەندامدا شــتی زۆر ســەیر و ســەمەرە ئەنجــام دەدەن لەوانــە ڕووت کردنــەوەی ئــەو کەســە لەبەرچــاوی کۆمەڵــێ ئەنــدام کە بە شــێوەی بازنەیی دەوەســتن و ئەندامــە نوێیەکەش بــە ڕووتی لە ناوەڕاســتەوە دادەنێــن و کۆمەڵێ کاری شــەرم ئامێزی سێکســی پێ ئەنجام دەدەن و پاشــان بــە ڕووتی لە تابوتێکــدا بۆ ماوەیەك دەیخەوێنن و پاشــان بە ئــاگای دەهێننەوە و ناوێکــی نوێــی لێدەنێــن و پێی دەڵێــن تۆ ســەرلەنوێ لەدایــك بوویتەوە، دواتــر بە کۆمەڵ خوێــن دەخۆنــەوە و کۆتا کاریان ســوێند دەخــۆن کە نهێنی کۆمەڵەکــە بپارێزن؟؟!!

لێــرەوە ئــەم ئەندامــە نوێیــە یەکلادەبێتــەوە بــۆ پاراســتنی خوداوەندی ئیغریقیــەکان!!! (١٥) هــەزار دۆلاری پێدەبەخشرێت وە لە کاتی هاوســەرگیریدا (کاتژمێرێکــی قوڕمیش و خولەك ژمێری گــەورە) کە هێــمای ئەندامێتیە[١٤]. بوون بە ئەندامی بۆشــی بــاوك لەســاڵی ١٩٤٨ زۆر برەوی بــەم ڕێکخــراوەدا، توانی تەماشــای تابووتەکە بــکات کە پەیکەرە ئێســکێکی تێدابوو، وە پەردەی لەســەر وێنەی ســەرۆکی ڕێکخراوەکــە لادا کە ئافرەتێك بــوو بەنــاوی (کونابیال بلیس) دەبوایــە هەمــوو ئەندامێــك لەبەرامبــەر ئەم وێنەیــە دان بە هەموو شــتێکدا بنێت. پاشــان لەســاڵی ١٩٦٨ز بۆشــی کوڕیش بوو بــە ئەندام لــەم ڕێکخراوە، لێــرەوە دووان لــە ســەرۆکەکانی ئەمریکا بوون بــە ئەندام لــەم ڕێکخراوە.

---

١٤ سەرجەم ڕێوڕەسمەکانیان هەمان ڕێوڕەسمی ماسۆنیەکانە کە یەکێکە لە ڕێکخراوە هەرە کۆنەکانی جیهان.

**بەناوبانگترین ئەندامەکانی:**

- ئەلفونسـوتافت (یەکێـك لـە دامەزرێنـەران) وەزیـری جەنگـی وولاتی ئەمریـکا لـە سـالانی (١٨٧٦-١٨٨٠)، ئەندامـی ماسـۆنیەت لە هەمـان کاتدا.

- ولیـام هواردتافـت: سـەرۆکی دادگای بـالا و سـەرۆکی (٢٧) وویلایەتـی ئەمریـکا، کـوڕی ئەلفونسـوتافت و مێـژووی ئەندامێتی سـالی ١٨٧٨.

- هنرلویس ستیمسـون: وەزیری جەنگ لـە کاتی سـەرۆکایەتی تافت(١٩٠٨-١٩١٢)، لەکاتـی سـەرۆکایەتی ڕۆزفلت وُ ترومـان (١٩٤٠-١٩٤٦)، وەزیری دەرەوە لەکاتـی سـەرۆکایەتی هربـرت هوفـر (١٩٢٩-١٩٣٣) دەوترێت ئەم لە پشـت بەکارهێنانـی بۆمبـی ناوەکییەوە بووە لـە دژی یابان.

- بریسـکوت بۆش(بۆشـی باپیـرە): کاری بانکـی دەکرد و سەرپەرشـتیاری سـامان و پارەی نـازی یەکانی دەکـرد لەسـەرەتای جەنگی جیهانـی دووەمدا، سـیناتۆر لەسـەر وویلایەتـی کونیتیکوت.

- (جـۆرج بـۆش) ی باوك: مێـژووی ئەندامێتـی ١٩٤٨، ئەندامـی کۆنگرێس ١٩٦٤-١٩٧٠، سـەرۆکی دەزگای هەواڵگـری ١٩٧٥-١٩٧٧، سـەرۆکی ئەمریـکا ١٩٨٨-١٩٩٢، بنیاتنـەری یەکـەم هاوپەیمانێتـی دژی عێراق، یەکـەم کەس بوو زاراوەی سیسـتەمی جیهانـی نـوێ ی بەکارهێنا کـە دروشـمی نورانیەکانە.

- (جـۆرج بۆش) ی کوڕ: مێـژووی ئەندامێتـی ١٩٦٨، فەرمانڕەوایی وویلایەتی تەکسـاس، سـەرۆکی ئەمریکا(٢٠٠٠-٢٠٠٨).

- جـۆن کێری: مێژووی ئەندامێتی١٩٦٦، سـیناتۆر، پاڵێـوراوی دیموکراتەکان بۆ سـەرۆکایەتی ساڵی ٢٠٠٤.

- ریتشـارد جو: مێـژووی ئەندامێتـی ١٩٥٥ سـەرۆکی کۆمپانیـای زاباتا بۆ نەوت.

- جـۆن هاینزی دووەم: مێـژووی ئەندامێتی ١٩٣١ سـەرۆکی کۆمپانیای هاینز بـۆ خواردەمەنی.

- ئارتیمـوس حایتس: مێژووی ئەندامێتی ١٩١٨، سـەرۆکی سـندوقی نیویۆرك،


منتدى إقرأ الثقافي

کۆمپانیاکانی تای ـۆینگ، پاسـیفیك یونیۆن.

- لـه پیاوانـ هەواڵگـری و دەزگا سـیخوڕییەکان دەیان کەسـی دەسـت ڕۆیشـتوویان د ـووە، لەوانە:- (ولیام ماك، هیو ویلسـن ) مێـژووی ئەندامێتی ١٩٠٩ز، ولیـام ـلـی ١٩٥٠ز، فان داین ١٩٤٩ز، سـولان کوفیـت ١٩٤٩ز، روبن هولدن ١٩٤٠ز، ـشـارد مـور ١٩٣٦ز، هتد......).



سەرۆك بۆش لـەان ئەندامانی کۆمەڵەی کاسەسەر و ئێسقان

منتدى إقرأ الثقافي

## برایانی پێچراوە و کلیل[15]

ڕێکخراوێکی نهێنییــــە، جۆن ئەدیســـۆن بورتر لەزانکۆی (یال) لەســـاڵی ١٨٤٢ بنیاتینـــاوە، هۆکاری دروســـتبوونی ململانێ و کێبڕکێکردنی ڕێکخراوی (کاسەســـەر و ئێســـقان) بـــوو، لەخوێنـــدکارە دامەزرێنەرەکانیان پلەو پایـــەی زۆریان وەرگرت لەوانە (ثیـــۆدۆر رونین) فەرمانڕەوای ویلایەتی نیوجێرســـی (ئیســـحاق هیســـتر) ئەندامـــی کۆنگرێس، (لیوناردکیـــس) دامەزرێنەری زانکۆی (کیس ویســـترن).

لە ئەندامە بەناوبانگەکانیان ئەمانەن:

- هارفـــی کوشـــینج: مێـــژووی ئەندامێتـــی ١٨٩١ یەکێکـــە لەبەناوبانگتریـــن پزیشـــکەکانی مێشـــك لەســـەدەی بیســـتەمدا، بەباوکی نەشـــتەرگەری مێشـــك ناسراوە.

- فرانك بولك: مێـــژووی ئەندامێتی ١٨٩٤، پارێـــزەر و وەزیری دەرەوەی وولاتی ئەمریـــکا لەســـەردەمی جەنگی جیهانـــی یەکەم.

- دیـــن ئەتشیســـون: مێـــژووی ئەندامێتـــی ١٩١٥ وەزیـــری دەرەوەی وولاتی ئەمریـــکا لەســـاڵانی ١٩٤٩-١٩٥٣ ئەندازیـــار و داڕێـــژەری سیاســـەتی دەرەوەی ئەمریـــکا لە کاتـــی جەنگی ســـارددا.

- جـــۆن ئیندەرز: مێـــژووی ئەندامێتی ١٩١٩ دۆزەرەوەی کوتـــان دژی ئیفلیجی منـــداڵان، هەڵگـــری خەڵاتی نۆبڵ لەســـاڵی ١٩٥٤.

- کول بۆرتەر: مێژووی ئەندامێتی ١٩١٣، میوزیسیان.

- بنجامیـــن ســـبوك: مێـــژووی ئەندامێتـــی ١٩٢٥ یەکێـــك لـــە پزیشـــکە سەرمەشـــقەکانی بـــواری منـــداڵان.

- ڕۆبـــەرت واجنـــەر: مێژووی ئەندامێتی ١٩٣٣ ســـێ جار ســـەرۆکی شـــاری نیویـــۆرك بـــووە، باڵیـــۆزی وولاتەکەی بووە لـــە ئیســـپانیا و ڤاتیکان.

- ســـارجنت شرایفـــەر: مێـــژووی ئەندامێتـــی ١٩٣٨ دامەزرێنـــەری یەکەکانی ئاشـــتییە، دامەزرێنـــەری یارییـــە ئۆلۆمپیادی خـــاوەن پێداویســـتییە تایبەتەکانە.

١٥ ئەم ڕێکخراوە دروشمەکەیان گوزارشتە لە کلیلێك پێچراوەتەوە بەپارچە قوماشێك.


منتدى إقرأ الثقافي

- ســـايروس فانس: مێـــژووی ئەندامێتـــی١٩٣٩، وەزیری ســـووپا لە ســـاڵانی ١٩٦٢-١٩٦٤، وەزیـــری دەرەوە لەســـاڵانی١٩٧٧-١٩٨٠.

- كورد ماير: مێژووی ئەندامێتی ١٩٤٣ پیاوی دەزگای هەواڵگری.

- بـــارت جيماتـــی: مێـــژووی ئەندامێتـــی ١٩٦٠ ســـەرۆكی زانكـــۆی (يال) و سەپەرشـــتياری يەكێتـــی بەيســـبۆڵ.

- كافلين تريلين: مێژووی ئەندامێتی ١٩٥٧ ميوزيسيان و چيرۆكنووس.

## ڕێكخراوی سەرۆك و سەركردەكانی ماسۆن (بيلدربرگ)[١٦]

دەســـتەيەكی نهێنـــی جيهانييـــە پێـــك دێـــت لـــەو كەســـايەتييە خـــاوەن كاريگەرێتـــی و بەهێزانـــەی كـــە ڕۆڵيـــان هەيـــە لە جيهانـــدا. ســـاڵانە جارێك كۆدەبنـــەوە و هێڵكاری سياســـەتی جيهانـــی دادەڕێـــژن، بڕيارەكانيـــان نهێنييە. ســـاڵانە ١٢٠ كـــەس ئامـــادەی كۆبوونەوەكـــە دەبن، كە يەك لەســـەر ســـێيان لە وڵاتـــی ئەمريـــكاوە دێـــن، ئەوانی تر لـــە وڵاتـــی ئەوروپـــاوە ئامادەدەبن، بە شـــێوەيەكی زۆر نهێنـــی و لەژێـــر پاســـەوانێتيەكی زۆر ووردا لـــە يەكێـــك لـــە وڵاتەكان دەبەســـترێت.

ئامادەبـــووان پێكدێـــن لـــە: پاشـــاكان، ســـەرۆكەكان، ڕاوێـــژكارەكان، پياوانی كار و پيشەســـازييەكان، كۆمپانيـــا گـــەورە جيهانييـــەكان، وەزيرانـــی دارايـــی و پياوانـــی بانكەكان و ئاڵوگـــۆڕی دراو، ســـەركردە ســـەربازييەكان، نوێنەری بانكی نێودەوڵەتـــی و دراوی نێودەوڵەتی، ڕێكخـــراوی بازرگانی جيهانـــی و ڕاگەياندكارە لێهاتـــووەكان...... هەمـــوو پەيـــمان دەدەن بە پاراســـتنی نهێنـــی و بڕيارەكان.

هەندێك لە ئەندامەكانيان:-

- جوزێـــف ريتنيجەر: كەســـێكی ئەمريكييە و خاوەنی بيرۆكـــەی دامەزراندنی دەســـتەيەكی جيهانييە بۆ يەكخســـتنی جيهان لـــەرووی دامـــەزراوە داراييەكان و

١٦ بيلدربرگ: ناوی ئەو هۆتێلەيە لە شاری (ليدن) لە وڵاتی هۆڵەندا كە يەكەم دانيشتنی دامەزراندنيان تێدا ئەنجامدا لەساڵی ١٩٥٤.

منتدى إقرأ الثقافي

کۆمپانیــا گــەورەکان و تێپەڕاندنی نەتەوە و ســنووری وولاّتان (ئــەم بیرۆکەیە لە نووسراوەکانی جوولەکــەدا هاتووە).



- شــازادە برنارد: شــازادەیەکی ئەڵمانییە و هاوسەری شــاژنی هۆڵەندا (جولیانا) بووە، لەســاڵی ١٩٦١ ســندوقی جیهانی بــۆ ژیانی سرووشــتی دامەزرانــدووە، هەروەها یانەی (میرکریــوس) ی دامەزراندووە، ئــەم یانەیە هاوکاری لــە نێــوان پیاوانــی کار و پیاوانی ســەربازیدا دروســت دەکات. لەســەرەتاوە خــۆی و براکــەی یارمەتــی نازییەکانیــان دەدا، هــاوکاری یەکەکانــی (SS) یان دەکرد، هیتلــەر بانگی کــرد بۆ کۆشــك و پیرۆزبایی هاوســەرگیرییەکەی لێکــرد لەگەڵ شــاژنی هۆڵەندا پێش دەســت پێکردنی جەنگــی جیهانی دووەم، دوای دەســت پێکردنی جەنــگ لــە هــاوکاری کردنــی ئەڵمانــەکان پاشــگەزبووەوە و سەرپەرشــتی یەکەکانــی بەرگــری هۆڵەندای دەکــرد، لەکۆتاییدا بــوو بە فرۆکــەوان لە هێزی ئاســمانی بەریتانیا.

- لــۆرد دێنیس هیلــی: ڕامیاری کارێکــی بەریتانیە و پۆســتی وەزیری بەرگری ئــەو وولاّتەی هەبــووە لــە ســاڵانی (١٩٦٤-١٩٧٠)، بەرپرســیارێتی دارایی زۆر گــەورەی هەبووە لــە وولاّتدا و پێــی دەوترا ســەرۆك وەزیران.

- دیفیــد ڕۆکفیلر: کــوڕی پیاوی پــترۆڵ و نەوت جــۆن ڕۆکفیلــر، ئەندامی خێزانــی بەرپرســی لــە لقــی نورانیــەکان لــە وولاّتــی ئەمریــکا، ســەرۆکی بانکی(تشــیس مانهاتــن) لەســاڵانی(١٩٦٩-١٩٨١) پۆســتی زۆری وەرگرتووە لە ئەنجوومەنــی پەیوەندییەکانــی دەرەوە، لەســاڵانی (١٩٧٠-١٩٨٥) بــووە بــە ســەرۆکی ئەنجوومەنەکــە، هەروەها ســەرۆکایەتی فەخری دەســتەی ســیانیان


منتدى إقرأ الثقافي

پێبەخشـــیوە، ســـامانەکەی نزیکـــەی دوو ملیـــار و نیـــو دەبێت.

- والتر سمیث: بەڕیرسی دەزگای هەواڵگری CIA .

- دۆناڵد ڕامسفیلد: وەزیری بەرگری ئەمریکا.

لـــە کۆنگـــرەی ٢٠٠٤ لـــە وولاتـــی ئیتالْیـــا ئـــەم کەســـایەتییانە ئامادەبوون: (جۆرج بۆشـــی کوڕ، تۆنـــی بلێر، جیمس وڵفنســـۆن ســـەرۆکی بانکـــی جیهانی، جۆن براون ســـەرۆکی کۆمپانیـــای بریتیش پترۆلیـــۆم، میلاندا گیتـــس خێزانی بیل گەیتس (ســـەرۆکی مایکرۆســـۆفت و ملیاردێـــری جیهان).

## پیاوانی نورانیەکان و ماسۆنییەکان
## لە بەڕێوەبردنی وولاتی ئەمریکادا

لەســـەرەتاوە ماســـۆنیەکان وولاتی ئەڵمانیایـــان هەڵبژاردبوو بـــۆ ئەنجامدانی کار و چالاکییەکانیـــان، دواتر و دوای لەباربوونی ئەم وولاتـــە نوێیە واتە (ئەمریکا) ڕوانگەیـــان گۆڕی و بە لێشـــاو کۆچیـــان بۆ ئەم وولاتـــە کرد . لەســـەرەتادا (١٣) کەســـایەتی ماســـۆنی ڕێککەوتن لەســـەر دانانی دەســـتورێك بۆ وولاتی ئەمریکا، لەنـــاو ئـــەو کەســـایەتییانەدا (بنیامیـــن فرانکلین ســـەرۆکی ماســـۆنیەکانی لقی پەنســـیلڤانیا، جـــۆرج واشـــنتن یەکەمین ســـەرۆکی ئەمریکا خاوەنـــی پلەی (٣٣) لـــە ماســـۆنییەتدا دەبیـــنران). هەمـــوو پاڵێوراوێـــك بـــۆ ســـەرۆکایەتی ئەمریکا مەرجـــە و دەبێـــت ماســـۆنی بێـــت !!؟ ئەگـــەر ماســـۆنی نەبێت ناچێتە ســـەر کورســـی دەســـەڵات!! ئەم مەرجە لە دەســـتووردا نەنووسراوەتـــەوە، بەڵام خاڵی یەکلاکـــەرەوەی کێبڕکێکانـــی کاندیدەکانی ســـەرۆکایەتی وولاتـــی ئەمریکایە.

ئەم ســـەرۆکانە هەموویان ماســـۆنی بوون: (جۆرج واشـــنتن، تۆماس جیفرسۆن، ولیام هـــاوارد، فرانکلین ڕۆزفلت، ئەندرۆجاکســـۆن، هاری ترۆمـــان، جیراڵد فۆرد، ڕۆناڵد ڕیگان، جۆرج بۆشـــی باوك، جۆرج بۆشـــی کـــوڕ، ئۆباما).

وولاتـــی ئەمریـــکا نیشـــتیمانێکی نموونەیی یە بـــۆ نیشـــتەجێبوونی جوولەکە و ماســـۆنیەکان، لـــە ســـەرەتادا زۆربـــەی دانیشـــتوانی ئەمریکا لەو مەســـیحییە

منتدى إقرأ الثقافي

پرۆتستانتانه پێك دەهاتن كە لە سەدەكانی ناوەڕاست لە پاپا و كەنیسەی كاثۆلیك هەڵگەڕابونەوە، ئەوەندە تێكەڵاوی یەكتر بون تەنانەت سروت و دروشمە ئایینیەكانیشیان بە زمانی (عیبری) دەوتەوە، ئەوەندە كاریگەر ببون بە ئایینی جوولەكە منداڵەكانیشیان بەناوی پێغەمبەرانی جوولەكە وە ناو دەنا، لە كۆتاییدا لەلایەن ناوەندەكانی خوێندنی وولاتی ئەمریكاوە زمانی عیبری بە ڕەسمی كرا لەسەرجەم ناوەندەكانی خوێندن.

زۆرجار كۆچكردنەكەی خۆیانیان لە ئەوروپاوە بۆ ئەمریكا دەشوبهاند بە كۆچ كردنەكەی (موسا) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) لە وڵاتی میسرەوە بەرەو فەڵەستین.

كاتێك زانكۆی (هارفارد) بنیاتنرا لەساڵی ١٦٣٦ زمانی عیبری زمانی سەرەكی خوێندن بوو لە زانكۆكە و لەساڵی ١٦٤٢ یەكەم نامەی دكتۆرا گفتوگۆ كرا بەناونیشانی (زمانی دایك زمانی عیبرییە). ئەمریكا لەساڵی ١٨٨٤ یەكەم كونسوڵخانەی خۆی لەشاری قودس كردەوە، بەبەردەوامی راپۆرتیان بەرز دەكردەوە بۆ سەرۆكەكانی ئەمریكا و تیایدا باسیان لە پێویستبوونی دروست كردنی دەوڵەتێك بۆ جوولەكەكان لە فەڵەستین دەكرد، لەساڵی ١٨٩١(ولیام بلاكستۆن) دوای گەڕانەوەی لەشاری قودس لە ڕاپۆرتێكدا بۆ سەرۆكی ئەمریكا (بنیامین هادیسۆن) سەرۆكی ژمارە ٢٣دەڵێت: گەورەم دەبێت چاو لە ئیمپراتۆر (كۆرش) ی فارسی بكەیت كە جوولەكەكانی لە شاری بابل ڕزگاركردووە و گەڕاندنیانییەوە وڵاتی فەڵەستین.

كار دەگاتە ئەوەی لە سەرۆكەكانی ئەمریكا هۆشیاری لەبارەی جوولەكەكانەوە بدەنە ناوەند و فەرمانگەكانی وولات سەبارەت بەو داگیركارییە دارایی و بانكیانەی بانك و سەرمایەدارەكانی جوولەكەكان ئەنجامیان دەدا.

(تۆماس جیفرسۆن) سەرۆكی ژمارە ٣ دەڵێت: بانك و دامەزراوە ئابوورییەكانی جوولەكە بە ئەندازەی لەشكرێكی ئامادە مەترسییان بۆ سەر

ئـــازادی هاوڵاتیانمان هەیـــە بۆیە دەبێت ســـنووریان بۆ دابنرێت. لەســـاڵی ١٨٨١ ناســـان ئەمشـــبل ڕۆتشـــیڵد ئاگادارکردنەوەیەکی تونـــدی ئاڕاســـتەی حکومەتی ووڵات کـــرد، ئەگەر بێـــت و بەرکەوتـــەو و بەخششـــە داراییەکانـــی بانکەکانمان بـــۆ نوێ نەکرێتـــەوە ئەوا ولات تووشـــی گێـــژاو دەبێت!!!

ئەمریکییـــەکان باوەڕیان بـــەم ئاگادارکردنەوەیـــە نەکرد....... کەچـــی لەناکاو جەنـــگ لە نێـــوان بەریتانیـــا و ئەمریـــکا هەڵگیرســـا؟؟؟ بێگومان خـــاوەن بانکە بەریتانییەکان لەپشـــت ئەم کارەوە بـــوون بە مەبەســـتی داڕووخاندنی خەزێنەی ئەمریکا لێـــرەو ووڵات ناچاربـــوو داوای یارمەتی لە بانکەکانی ڕۆتشـــێڵد بکات؟؟ ئەویـــش داواکاریەکەی بەســـتەوە بە نوێکردنـــەوەی بەخششـــە داراییەکان بەبێ ئەوەی گـــوێ بدەنە شـــەڕ و ئەو هەموو کوشـــتنە؟؟.

ســـەرۆك فرانکلین ڕۆزفیلت ســـەرۆکی ژمـــارە ٣٢ دەڵێت: تەنهـــا (٦٠ ) خێزان دەســـتیان بەســـەر ئابـــووری ووڵاتـــدا گرتـــووە، یەك لەســـەر ســـێی هاووڵاتیان دەناڵێنـــن بەدەســـت خراپی بـــاری ئابـــووری و بێ خانـــووی ییـــەوە. یەکێك لە پیاوەکانـــی ماســـۆنیەکان خەڵکی (ســـکۆتلەندا ) بـــوو لەخۆیـــان هەڵگەڕایەوە و کتێبێکـــی دانا بەنـــاوی (بەڵگەکان لەســـەر پلانەکانـــی نورانیەکان بـــۆ ڕمان و تێکدانی ســـەرجەم حکومـــەت و ئایینەکان).

ئامانجـــی ســـەرەکی نورانیەکان هەڵگیرســـاندنی جەنگ و شـــوڕش بەرپاکردن و نانـــەوەی پشـــێوی و ئاژاوەیـــە لـــە ووڵاتانـــی جیهانـــدا..... کاتیـــك مارکس و ئەنجلـــس کتێبەکەیـــان نووســـی بەناوی(ســـەرمایە) و لەکاتـــی دامەزراندنـــی حزبـــی شـــوعیدا و دەرکردنـــی یەکـــەم بەیاننامەیاندا(بەیاننامـــەی دامەزراندن)، لەلایـــەن نورانیەکانەوە هـــاوکاری دارایـــی زۆریان پێشکەشـــکرا.....

ســـەرۆکی ئەوکاتـــەی نورانییـــەکان (وایس هاوبـــت) بوو لە شـــاری لەندەن دەژیـــا.... ناوبـــراو لەســـاڵی ١٨٣٠ کۆچی دوایی کـــرد، لە کۆتا ســـاتەکانی ژیانیدا وای نیشـــان دەدا کـــە لـــە نورانیەت پاشـــگەزبۆتەوە؟؟ بـــەڵام وانەبـــوو تەنها بۆ هەڵخەڵەتاندنـــی دەوروبەرەکـــەی وای دەردەخســـت.

ســـاڵی ١٨٣٤ نورانیـــەکان ســـەرکردەیەکی نوێیـــان بـــۆ خۆیـــان هەڵبـــژارد بەنـــاوی (جوســـیبی مازینـــی) ئەم پیـــاوە درێـــژەی دا بەبەرنامە شـــەڕخوازی و تێکدەرانەکانـــی نورانیـــەکان، هەروەهـــا لەســـاڵی ١٨٤٠ جەنەڕاڵێکـــی ئەمریکی کەنـــاوی (پایـــك ) بوو هێنایـــان بـــۆ لای (مازینی) و ناوبـــراو بەخێرایـــی بە بیر و بۆچوونەکانـــی (مازینـــی) ڕازی بـــوو، زۆر پێـــی سەرســـام بـــوو، (پایـــك) بوو بـــە ئەندامێکـــی کارا و چـــالاك لـــە ڕێکخراوەکـــە، لەکۆتاییدا بوو بە ســـەرۆکی دەســـتەی پیلانگێڕی نورانیـــەکان!!... هـــەر ئـــەم جەنەڕاڵە ســـەربازییە لەنێوان ســـاڵەکانی (١٨٥٩-١٨٧١) پـــلان دارێژەربـــووە بۆ هەڵگیرســـاندنی ســـێ جەنگی گەورەی جیهانی لەســـەرەتای ســـەدەی بیســـتەمدا و، بەرپاکردنی ســـێ کارەساتی مرۆیـــی گـــەورەی جیهانـــی کە دواجـــار هەمـــوو ئـــەم کارەســـاتانە ببنە هۆی بڵاوبوونەوەی شـــەڕ و ئـــاژاوە و کارەســـات و نەهامەتـــی زۆر بـــۆ مرۆڤایەتی!! ئەمـــەش ڕێخۆشـــکەربێت بـــۆ پەیدابوونـــی (دەجـــال) و فەرمانڕەوایـــی کردنی هەمـــوو جیهـــان لەلایەن ئـــەوەوە؟؟؟.

زۆربەی ســـەرۆکەکانی ئەمریـــکا بە ئاشـــکرا ئەوەیان دەربڕیوە کـــە ئەندامن لـــەم ڕێکخراوە یـــان هەندێك لـــە ســـەرۆکەکان ئەگەرچـــی بە گفتـــار ئەوەیان دەرنەبـــڕی بێت بەڵام بە کـــردار لە هەرچی کـــۆڕ و کۆبوونەوەی ئـــەم ڕێکخراوە هەیە بەشـــدارییان کردووە و وتاریان پێشـــکەش کردووە، ســـیان لە سەرۆکەکانی وڵاتـــی ئەمریـــکا ئەندام نەبـــوون لە ماســـۆنیەت دووانیـــان کـــوژراون (ئایزن هـــاوەر، کینیدی) وە یەکێکیشـــیان لەســـەرکار لادراوە بەناوی (نیکســـۆن)!!؟؟....

هەروەهـــا ئـــەم ســـەرۆکانەش ناسراو بـــوون بە ئەوپـــەڕی پابەندی و دڵســـۆزی تەواوەوە بۆ ســـەرجەم بڕیارەکانی ماســـۆنیەکان لەوانە: (جۆنســـن، فـــۆرد، ڕیگان، بۆشـــی باوك، بۆشی کوڕ).

هەوڵی ماســـۆنییەکان تەنها بەوەوە نەدەوەســـتا کە دەســـت بەســـەر هەندێ دام و دەزگا و بـــواردا بگـــرن، بەڵکو هەوڵیان داوە دەســـتیان بگاتە هەندێ شـــوێنی هەســـتیار وەکو دەســـتەی ئاســـمانی و لێکۆڵینەوە نێودەوڵەتییەکان (ناسا)، تەنانەت


منتدى إقرأ الثقافي

کەشتیوانی ئاسمانی رووسی (ئولغ بلاتۆنۆف) دەڵێت: لە سەردانێکمدا بۆ شاری (دالاس) بۆ شوێنێکی ماسۆنییەکان کە وەك پێشانگایەك وابوو وێنەی زۆرێك لە کەشتیوانە ئاسمانییە ئەمریکییەکانم بینی، ئەم کەشتیوانانە لەسەر ڕووی مانگ هەندێ دروشم و سروتی ماسۆنیان ئەنجام دەدا؟؟؟ تەنانەت دوو مستیلە ئاڵتونیەکەشم بینی لە دەستیاندا!! ئەوکات نەمدەزانی مانای چییە؟؟ بەڵام دواجار دوو ڕۆژنامەنووس ئەم نهێنییەیان ئاشکرا کرد لەکاتی چوونە سەرمانگدا واتە لەسەر ڕووی مانگ کەشتیوانەکە ئەم مستیلانە لە پەنجەی خۆی دەکات بە مەبەستی پەیوەندی ڕووحی بەستن لەگەڵ ئەو جیهانە ڕووحیانەی کە لە بۆشایی ئاسمان و لەسەر ڕووی مانگ هەن؟؟؟

ماسۆنیەکان بە هەماهەنگی لەگەڵ جوولەکەکانی ئەمریکا دەستیان کرد بە دژایەتیکردنی مەسیحییەکان لەسەرجەم ناوەند و قوتابخانە و زانکۆکاندا، زۆربەی خاچ و پەیکەرەکانی مەسیح یان لابرد لەسەر بینا و شوێنە گشتییەکان، کار گەیشتە ئەوەی پیلانرێژی بکەن بۆ سەرلەنوێ نووسینەوەی (ئینجیل) و لابردنی هەموو ئەو دەقانەی کە بەدڵی جوولەکە و نورانیەکان نین؟؟؟

ئەم ئینجیلە نوێیە دەستکاریکراوە کرایە بازاڕەوە و لەفرۆشگا ماسۆنیەکان دەفرۆشرا، لەسەر بەرگی ئینجیلەکە هێمای ماسۆنی و ئەستێرەی داود نەخشێنرابوو......؟؟!

مەسیحییە کاتۆلیکییەکان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەچەوسێنرێنەوە و بۆیان نییە ڕەخنە لە هەندێ کاری نەشیاو لەناو کۆمەڵگە بگرن وەك کارەکانی (نێربازەکان و ئەوانەی کارە سێکسیە نەشیاوەکان ئەنجام دەدەن) و هەرکەسێك ڕەخنە بگرێت ڕووبەڕووی یاسا دەبێتەوە، دیاردەیەکی تری نەشیاو پەرستنی شەیتانە کە لەم ڕۆژگارەدا لەنێو گەنجانی ئەمریکادا زۆر پەرەی سەندووە و بەرەوی پێدەدرێت، هەموو ئەم کارانە و چەندین دیاردەی تری نەشیاو کە بە شێوەیەکی بەربڵاو لە وڵاتدا بڵاوبۆتەوە و مەسیحییە

میانـــڕەوەکان زۆر پێیان ناخۆشـــە و هیچ دەســـەڵاتێکیان نییە.

لەســـەردەمی (ترۆمـــان)ەوە جوولەکـــە ٪٥٠-٪٦٠ ســـەرجەم پێگە سیاســـی و ئابـــووری و بازرگانـــی و ڕاگەیاندنیان لـــە وولاتی ئەمریکادا بەدەســـتەوەیە،گەورە حاخامـــی جوولەکە لە شـــاری واشـــنتن دەڵێت: ئەمـــڕۆ ئێمە لە وولاتـــی ئەمریکا وا هەســـت دەکەیـــن لـــە وولاتـــی خۆمـــان دەژیـــن لەســـەرجەم فەرمانگە و دەزگاکان لـــە ناوەنـــدی بڕیاردایـن و ویســـتی چیمان هەبێـــت ئەنجامی دەدەین.

گەورەتریـــن گۆڕانـــکاری لەســـەردەمی (بیـــل کلینتـــۆن) دا ڕووی دا ئەویش بە دەرکردنـــی کۆمەڵێـــك بڕیار کـــە یارمەتـــی دەربوو بـــۆ زیاتر بوونـــی هەژموونی جوولەکەکان لەســـەرجەم ناوەندەکاندا، هەموو ســـەرۆك و ســـەرکردە سیاسییەکان ئەرکە لەســـەریان دەبێـــت ســـەردانی پەرســـتگەی جوولەکەکان بکەن لە شـــاری واشـــنتن و بچەمێنـــەوە لەبەرامبەر حاخامەکەیانـــدا!!! ئەم پەرســـتگەیە لەڕووکاری دەرەوەی بـــە دوو ئـــاڵای ئەمریـــکا و ئیسرائیل نەخشـــێنراوە..... یەکێکـــی تر لەو کردارانـــەی دەبێت هەموو ســـەرۆکێکی ئەمریـــکا ئەنجامی بدات ســـەردانیکردنی (ئیسرائیـــل)ەو دانانـــی چەپکە گوڵە لەســـەر گڵکـــۆی (تیۆدۆر هرتـــزل و فلادیمێر جابوتینســـکی) هەمووســـەرۆکەکانی ئەمریکا لەدوای جەنگی جیهانـــی دووەمەوە بەردەوامن لـــە ئەنجامدانی ئـــەم کارە..!!!

ســـەبارەت بە سیســـتەمی بانکی ئەمریکا هەمـــووی لەژێـــر کۆنترۆڵی خاوەن بانکـــە جوولەکەکاندایـــە، لەوانـــەش ڕۆتشـــێلد لە لەنـــدەن و پاریـــس، برایانی لازارس لـــە پاریس، اسرائیل شـــێف لە ئیتاڵیـــا، کۆن لاب لە ئەڵمانیـــا، فاربورغی لە ئەڵمانیـــا و هۆڵەندا، برایانـــی لیمان لە نیویـــۆرك، غوڵدمان و زاکس لـــە نیویۆرك، ڕۆکفیلـــر لە نیویـــۆرك، ســـاڵانە پیاوانی ســـەرمایەداری جوولەکـــە چەندین ملیار دۆلار لەسەرتاســـەری جیهان قازانـــج دەکەن، لێرەوە ســـەرمایە و چالاکی بانکەکان و بانکـــی یەدەگی فیدراڵـــی ئەمریکا هەمـــووی لەژێر کۆنترۆڵـــی جوولەکە دایە و نە ســـەرۆکی ئەمریـــکا و نـــە وەزارەتی گەنجینـــە و نە دەوڵەت دەســـەڵاتیان بەســـەریانەوە نییە؟؟؟

## وێنەی ماسۆنیەکان لەسەر دراوی دۆلاری ئەمریکی

ماسۆنیەکان بۆ ئەوەی پیشانی ئەمریکا و هەموو جیهانی بدەن کە ئەوە ئەوانن وولاتی ئەمریکا گەورەترین و زلهێزترین وولاتی جیهان بەڕێوەدەبەن و لێرەوە هاتوون وێنەی سەرکردەکانی خۆیان لەسەر دراوی دۆلار بە هەموو جۆرەکانیەوە داناوە.




١. لەسەر دراوی یەك دۆلاری: وێنەی جۆرج واشنتن دانراوە، ناوبراو یەکەم سەرۆکی ئەمریکا بووە و سەرکردەیەکی ماسۆنییە، سەرکردەیەکی سەربازی بووە لەکاتی جەنگی ڕزگاربوون لە بەریتانییەکان، هەر ئەویش دەولەتی سەربەخۆی ئەمریکای ڕاگەیاند، هیندییە سوورەکان پێی دەڵێن ڕووخێنەری شارەکان، لەکۆی ٣٠ شارۆچکەی هیندییە سوورەکان ٢٨ یانی ڕووخاندووە، هەر ئەو لەساڵی ١٧٧٩ داوای لەیەکێك لە جەنەڕاڵەکانی سووپاکەی کرد بەناوی (جۆن سیلفان) ماڵەکانی هیندییە سوورەکان بکات بە گۆڕ بۆیان.

٢. لەسەر دراوی دوو دۆلاری: وێنەی (تۆماس جیفرسۆن) دەبینرێت کە بە باوکی ئەمریکا و نووسەری یاداشت نامەی سەربەخۆبوونی ئەمریکا دەناسرێت، یەکێکە لە ماسۆنیە بەناوبانگەکان و تەنانەت زۆر بەرگری لە شۆڕشی فەڕەنسا دەکرد، لەکاتی جەنگدا لە ویلایەتی ڤێرجینیا

منتدى إقرأ الثقافي




هەڵهـات و بــە ترسـنۆكی تۆمەتبـار كـرا، یەكێـك بــووە لەلایەنگــرە سەرســەختەكانی لەناوبردنی هیندییە ســوورەكان، بەبەردەوامــی ناكــۆك بــووە لەگــەڵ هاوكارەكانیــدا و هۆكارەكەشــی ئەوە بووە كە ئەم گێچەڵی سێكســی بە هاوســەرەكانیان دەكرد، ئــەم هەواڵانــەش بەبەردەوامی لەســەر ناوبراو لــە ڕۆژنامەكاندا بــڵاو دەكرایەوە بــەڵام ئەو گرنگــی پێنەدەدا.

٣. لەســەر دراوی پێنج دۆلاری: وێنەی (ئەبراهام لنكۆڵن) ســەرۆكی ژمارە ١٦ ی ئەمریــكا دەبینرێت، لەســەردەمی ئــەودا هەرێمەكانــی باكور كــە لە هیندییە ســوورەكان پێــك هاتبــوون جیابوونــەوەی خۆیــان ڕاگەیانــد، ناوبــراو زۆر بێبەزەییانــە لــە دژیــان جەنگا و ســەرجەم ناوچە و شــارۆچكە و لادێكانیانــی وێران كــرد، هەروەها دەســتەواژەیەكی زۆر بێبەزەییانــەی هەیــە كە دەڵێــت: (هیندییە ســووری باش ئەوەیانــە كە مردووە ؟؟)، زۆر ڕەگەزپەرســت بــووە و بەهیــچ شــێوەیەك ڕازی نەبووە بە یەكســانی نێوان ڕەشپێســت و ســپی پێستەكان!! لەســاڵی ١٨٦٢ز ســی و هەشت سەركردە و پیــاوی ئایینی هیندییە ســوورەكانی لەســێدارە دا، هەر لەو ســاڵانەدا نزیكەی ســێ ســەد كەســی تری لێیاز لەســێدارەدا تەنهــا لەبەرئــەوەی داوای ماف و ئازادی و ژیانیــان دەكرد.




(ســیاتل) یەكێــك لەســەركردەكانی هیندییــە ســوورەكان نامەیەكــی زۆر خەمبــاری بــۆ (لینكۆڵن) نــاردووە و تیایــدا دەڵێت: مــن دەزانم لــە كاتێكدا كــە ئێمە خۆمــان ڕادەســت دەكەین، بــەڵام تۆ هــەر دەمانكوژیــت....داوات



منتدى إقرأ الثقافي

لێدەکـــەم بەزەیـــت بـــە ئاژەڵەکانمانـــدا بێتـــەوە... بەداخەوە وەڵامـــی لینکۆڵن بریتـــی دەبێت لـــە: لەناوبردنی هەمـــوو هۆزەکـــە و تەنانەت ئاژەڵەکانیشـــیان و هەمـــوو ئەوەی کـــە هەیانبوو؟ لـــە کۆتاییـــدا خێزانەکەی تاوانبارکـــرا بەناپاکی هاوســـەرگیری!! دواجـــار دوای مانگێك لـــە دووبارە هەڵبژاردنەوەی بە ســـەرۆکی ئەمریکا لـــە ڕووداوێکـــی نادیاردا کـــوژرا، دوای کوژرانـــی لینکۆڵـــن هاوســـەرە ناپاکەکەشـــی شـــێت بوو؟!



٤. لەســـەر دراوی دە دۆلاری: وێنـــەی (ئەلیکســـاندەر هامیلتـــون) دەبینرێـــت، ناوبراو نورانـــی و ماســـۆنیەکی زۆر سەرســـەخت بـــووە، بەباوکـــی ئەمریکا نـــاسراوە، دامەزرێنەری کۆمەڵێ بانك و دارێژەری هەندێك یاســـا و ڕێســـای بانکی و دراوییـــە کەتـــا ڕۆژگاری ئەمـــڕۆش کاری پێدەکرێـــت لـــە وولاتـــی ئەمریکادا.

ڕەفتارە سێکســـی یـــە نەشـــیاوەکانی زۆر بـــوون و دەنگی داببـــۆوە!! لەیەك کاتـــدا پەیوەندی لەگـــەڵ چەنـــد ئافرەتێکدا هەبـــووە لەوانە خوشـــکی خێزانی، هاوســـەرەکەی کاتێك بـــەم پەیوەندییانـــە دەزانێت دەیەوێت ئاشـــکرای بکات و بڵاوی بکاتەوە بـــەڵام لەبەامبەردا (هاملتۆنی هاوســـەری) بـــە کارەکەی دەزانێت و بەرامبـــەر بە بڕێـــك پـــارە بێدەنگـــی دەکات و خێزانەکەشـــی ڕازی دەبێت و بێدەنگـــی هەڵدەبژێرێـــت. هاملتـــۆن خاوەنی کـــوڕ و کچێك بـــووە، کوڕەکەی لـــە ڕووداوێکی نادیاردا دەکوژرێت و کچەکەشـــی تووشـــی نەخۆشـــی دەروونی دەبێت.... دواجار خۆیشـــی لەســـەر دەســـتی نەیـــارە سیاســـییەکانی بەتایبەتی (ئارۆن بـــر) جێگری ســـەرۆکی ئەمریـــکا دەکوژرێت.

٥. لەســـەر دراوی بیســـت دۆلاری: وێنەی ســـەرۆکی حەوتەم (ئاندرۆ جاکسۆن ) دەبینرێـــت، ناوبـــراو دامەزرێنـــەری پارتـــی دیموکراتەکانە و بەهـــۆی ڕەفتارە ســـەیر و گەمژەکانیـــەوە نەیارەکانی بە(گوێدرێـــژ) بانگیان دەکـــرد بۆیە دواجار



ئەویش وێنەی (گوێدرێژ)ی هەڵبژارد و کردی بە دروشمی پارتەکەی.

کەسێکی زۆر خوێنرێژ و ستەمکار بووە بەرامبەر بە هیندییە سوورەکان، ئارەزووی شێواندنی لاشەی مردووەکانی هەبووە؟؟؟ ڕۆژێکیان لە مەیدانی جەنگ هەشت لاشەی مردوویان هێنایە بەردەم خێمەکەی، خۆی بەدیار بەسەربازەکانییەوە دەوەستا و زۆر لەزەتی لە شێواندنی لاشەی مردووەکان وەردەگرت و دەیوت پێستەکانیان لێبکەنەوە و بەزەییتان بە منداڵ و ئافرەتەکانیاندا نەیەتەوە!؟؟

زۆربەی لادێکانی هیندییە سوورەکانی لە ویلایەتی(فلۆریدا) سووتاند. یەکێك لە کارە دڕندە و خوێناوییەکانی کۆکردنەوەی ٤٦ هاووڵاتی بەدیل گیراوی هیندییە سوورەکان بووە لە خانوویەکدا و بە زیندووی سووتاندونی، پاشان لە پاشماوەی خۆڵەمێش و ئاگری بەجێماوی جەستەی مردووەکان بەکۆمەڵ دەست دەکەن ـە پەتاتە برژاندن!!! بەهەمان شێوەی سەرۆکەکانی پێشووتر ناوبراویش زۆر ڕەفتاری سێکسی نەشیاوی هەبووە لەوانە مارەکردنی ئافرەتێك کە هێشتا هاوسەرداربووە؟؟ دایکی (ئاندرۆ جاکسۆن) ناوبانگی دەکردبوو بەوەی کە کاری لەشفرۆشی بۆ سەربازە بەریتانییەکان ڕێکدەخست!!! هەروەها خێزانی کوڕەکەی کە فەرمانبەری ناو کۆشك بووە لە ئابڕوچوونێکدا ئاشکرا دەبێت کە پەیوەندی نەشیاوی لەگەڵ فەرمانبەرەکانی ناو کۆشکدا هەبووە.

٦. لەسەر دراوی پەنجا دۆلاری: وێنەی (یولسیس گرانت) سەرۆکی هەژدەیەم دەبینرێت و (گرانت) لەسەردەمی (لینکۆڵن) دا سەرکردەیەکی سەربازی بووە، ڕەفتارەکانی لەکاتی جەنگدا ئەوەندە بێبەزەییانە و نەشیاو


منتدى إقرأ الثقافي



بـــوون هەمـــوو داب و نەریتێکی سـەربازی و مرۆی تێپەڕاندبوو، ئەمریکییـەکان دەڵێـن سـەردەمی سـەرۆکایەتی گرانــت ناسراوە بە ســەردەمی گەندەڵــی، چەندیــن گەندەڵـــی ئابڕوبەر لە ســـەردەمی کابینەکەیـــدا ڕووی داوە، لەســـەردەمی ئەمدا جوولەکـــەکان زۆر ڕقیان لێبوو دەســـتیان گرت بەســـەر بازاڕی ئاڵتووندا لە شـــاری نیویـــۆرك، وە هەموو کار و چالاکییەکـــی بانکی و بازرگانیان بۆماوەیەك وەســـتاند لەم شـــارەدا، ئـــەم کارەســـاتەش نـــاسراوە بـــە (هەینـــی رەش) لـــە ئەمریکا.

یەکێکـــی تـــر لـــە گەندەڵییەکانـــی دروســـتکردنی کۆمپانیایەکـــی وەهمـــی بنیاتنانـــی هێڵی شـــەمەندەفەر بووە بەناوی (کـــردت موبایلەر) لـــە ڕێگەی ئەم کۆمپانیایەوە توانیان نزیکەی بیســـت ملیۆن دۆلار لە نێوان ســـاڵانی(١٨٧١-١٨٧٣) لـــە گەنجینـــەی ئەمریکا ڕابکێشـــن و بیـــدزن. لەســـەردەمی گرانـــت دا وەزیری جەنگـــی ئـــەوکات بەوەرگرتنـــی بەرتیـــل تاوانبارکـــرا و درا بـــە دادگا..... ناوبراو مۆڵەتـــی کارکـــردن و بەخاوەنکردنـــی زەوی هینـــدی یـــە ســـوورەکانی دەدا بە کەســـانی تر لـــە بەرامبـــەر وەرگرتنی بڕێـــك پارەدا.

٧. لەســـەر دراوی ســـەد دۆلاری: وێنـــەی کەســـی ماســـۆنی هەرەگـــەورەی ئەمریکا(بنیامیـــن فرانکلیـــن) دەبینرێـــت، ناوبـــراو تەنهـــا بـــۆ یـــەك ڕۆژێـــش ســـەرۆکی ئەمریکا نەبـــووە، بـــەڵام بـــە یەکێك لـــە دامەزرێنەرانـــی وڵاتـــی ئەمریـــکا دادەمەزرێنرێـــت، یەکێـــك بـــووە لـــە داڕێژەرانی



منتدى إقرأ الثقافي

دەسـتووری ئەمریـکا. لـە کاتێکدا کە باڵیـۆز بووە لـە بەریتانیـا پەیوەندی بە ماسـۆنیەکانەوە کردووە، دواتر پەیوەنـدی کردووە بە پەرسـتگەی(ئاگری دۆزەخ ) شـوێن کەوتووانی ئەم پەرسـتگەیە شـەیتانیان دەپەرسـت و دروشـمەکەیان (کۆئەندامـی زاوزێ و مـەی بـووە)؟؟؟؟

زۆر ڕێکخراوی ماسـۆنی هێناوەتە نـاو ئەمریکاوە و لەم کارەیدا سـەرکەوتوو بوو. کاتێك ویسـتیان دروشـمێك هەڵبژێرن بۆ مۆرە گەورەکـەی وولاتی ئەمریکا و لەلایەن کۆنگرێسەوە

(بنیامیـن فرانکلین) ڕاسـپێردرا بـۆ ئـەم کارە، ئەویش چیرۆکـی پێغەمبەر (موسـا) سـەلامی خـودای لەسـەربێت و دەرکردنـی جوولەکەکان لـە وولاتی میسر هەڵبژارد و پاشـا (جۆرج) ی سـێیەمی بەریتانیای دەچـووان بە فیرعەون!!! ئیلهامی لـەم چیرۆکەوە وەردەگـرت بۆ دروسـتکردنی مۆرەکە.

لەسـاڵی ١٩٨٩ لەکاتێکدا کرێـکارەکان خەریکی چاککردنـی ماڵەکەی(بنیامین فرانکلیـن بوون) لەشـاری لەندەن ئێسـك و پروسـکی دە کەسـیان دۆزییەوە، کـە هەندێکیان هی منداڵی دە سـاڵان بـوون؟؟!! کرێـکارەکان دەیانگوت ئەگەر زیاتـر بگەڕێیـن ئێسـك و پروسـکی زیاتر لـە بناغە و نـاو باخچـەی ماڵەکە دەدۆزینـەوە، ناچار وازیـان هێنا لە گەڕان و ئەو دۆسـیەیان داخسـت.




٨. لەسـەر دراوی پێنج سـەد دۆلاری: وێنەی سـەرۆکی بیست و پێنجەمینـی ئەمریکا(ولیـام ماکنلـی) دەبینرێـت، ناوبـراو یەکێـك بووە لە سـەرکردەکانی جەنگـی ناوخـۆی ئەمریـکا، (بۆرتەریکـۆ غـوام) دوورگەی هـاوای داگیرکرد و کردییە سـەر وولاتی ئەمریکا، هەروەهـا فلیپینی لە ئیسـپانیا بە بیسـت ملیۆن دۆلار کڕی بـە خەڵکەکەیەوە؟؟؟ کاتێـك هاووڵاتیانی


منتدى إقرأ الثقافي

ئەمریــکا بەمــە نارازیبوون هاتە نــاو خەڵکەکــە و ووتی من نیگام بــۆ هاتووە لەلایــەن خــواوە بۆیە ئــەم کارەم کردووە. لــە پەرلەمانی وولاتەکــەی ووتی من چەنــد شــەوە نەخەوتووم نوێــژم کــردووە، تا دواجار خــودا فەرمانــی پێکردم کــە فلیپین داگیــر بکەم؟؟؟

لــە کۆتاییــدا بۆ جیبەجێکردنی ئەم مەرامە شــەڕانگێزیە ی ســەد و بیســت و شــەش هەزار ســەربازی ناردە ســەر وولاتی فلیپین و ئەو وولاتــەی داگیرکرد، ئــەوەی ڕووی نەدابــوو لە تــاوان و دڕندەیــی لە مێــژوودا ئەمــان ئەنجامیان دا!!!؟

دەوترێــت لادێــی وا هەبــووە بە تــەواوی بە مــرۆڤ و ئاژەڵەکانیشــەوە ســووتاندوویانە، نزیکــەی یــەك ملیۆن هاوولاتی ســڤیلیان کووشــتووە؟؟؟

لەکۆتاییــدا دەبێت ئــەو ڕاســتییە بزانین کــەوا هەرچی ســەرۆکی ئەمریکا هەیــە لە کــۆن و نوێ دا هەموویــان بەبێ جیــاوازی خزمەتــکاری ئامانجەکانی نورانیەکان و ماســۆنیەکان بوون.



منتدى إقرأ الثقافي



سەرۆك تۆماس جێفرسۆن سەرکردەی گەورەی ماسۆنیەکان



سەرۆك جۆن کوینسی ئادەم سەرکردەی گەورەی ماسۆنیەکان



سەرۆك بیل کلینتۆن و ئاماژەی ماسۆنیەکان



سەرۆك وەزیرانی ئیتالیا(بیریکسۆنی) و ئاماژەی ماسۆنیەکان

منتدى إقرأ الثقافي

## نورانیەکان

- دروستبوونی کۆمەڵەی نورانیەکان.
- قۆرخکاری و دەست بەسەرداگرتنی بازاڕ، هەرەس پێهێنانی بۆرسە و ناوەندە دراوییەکان کاری لەپێشینەی جوولەکەکانە.
- پیلانە جیهانییەکانی نورانیەکان و فراوانبوونیان.



منتدى إقرأ الثقافي

# دروستبوونی کۆمەڵەی نورانیەکان

وشـــەی نورانی لە وشـــەی لوســـفیر (Lucifer) واتە (هەڵگری ڕووناکی) هـ وە هاتـــووە.... یان بونەوەری خـــاوەن ڕووناکی..... بنچینـــەی چیرۆکەکەش ئەوەیە کە شـــەیتان ناوی هەڵگری ڕووناکـــی لە خۆی و شـــوێنکەوتووەکانی نـــاوە، ئەمەش بۆ چاوبەســـت کـــردن و فـــرت و فێڵە لـــە شـــوێنکەوتووانی، لە ڕاســـتیدا تەنها بریتییە لە شـــەیتان پەرســـتن و دانانی شـــەیتان بـــە خوداوەنـــدی ڕووناکی؟؟؟

لێـــرەوە (عیســـا) پێغەمبـــەر ســـەلامی خـــوای لەســـەربێت ڕاســـتی نـــاو لێناون پێیانـــی وتوون (شـــەیتان پەرســـت) یان (گســـك لێدەری شـــەیتان). لەوکاتـــەوەی کە خـــودای میهرەبـــان ئادەمی دروســـت کردووە ســـەلامی خوای لەســـەربێت، شـــەیتان دەســـتی کـــردووە بە ئاژاوە گێـــڕی و ملکەچ نەکردن بـــۆ فەرمانەکانی خـــودای گەورە، ســـەرپێچی فەرمانـــی خودای گـــەورەی کرد لە ســـوژدە بـــردن بۆ ئادەم، باشـــتربوونی دەدایـــە پاڵ خـــۆی.... تا کار گەیشـــتە ئەوەی کە بوو بـــە هۆکاری دەرکردنـــی ئادەم و هاوســـەرەکەی لە بەهەشـــت ســـەلامی خوایان لەســـەربێت و ناردنیان بۆ سەر زەوی.

لێـــرەوە هەندێـــك لە مرۆڤەکانیـــش بوونە هاوکار و پشـــت و پەنای شـــەیتان بەتایبـــەت جوولەکـــەکان ئەمـــەش بـــۆ گەیشـــتن بـــە مەرامەکانـــی خۆیـــان و باڵادەســـتبوونی ئایینەکەیـــان.... بۆیـــە بە درێژایـــی مێژوو بیـــردۆزەی پیلانگێڕی و شـــەڕانگێزییان هەبـــووە!!! دەیـــان ڕێکخـــراوە و ئەنجوومەنـــی نهێنـــی یان دروســـتکردووە بەناوی جیاجیاوە و لەژێـــر پەردەی کاری چاکە و مرۆڤ دۆســـتی و خزمەتکـــردن بـــە توێژە جیاجیاکان، بەڵام لە پشـــتی پەردەوە و لـــە ژوورە نهێنی یەکانـــدا ئامانجی تـــر و پلانی تریـــان هەبووە..؟؟

نورانیـــەکان کۆمەڵـــە بنەماڵەیەکـــی بنەچە جیـــاوازن خۆشەویســـتی پارە و پابەندنەبـــوون بە هیـــچ ئایینێکەوە کۆی کردوونەتـــەوە.... دواجـــار پەیمانیان بە شـــەیتان داوە ئایینەکـــەی ئـــەو بڵاوبکەنـــەوە و دژایەتی خودای گـــەورە بکەن، لەسەرەتای دروســـتبوونیانەوە ســـیانزە خانەوەدا دروســـتیان کردووە وە هەر ئەم


منتدى إقرأ الثقافي

سـیانزە خانەوادەیـە باڵادەسـتن لە جیهانـدا نیـوەی هەموو سـامانی جیهان لـەلای ئەمانە... زۆربـەی کۆمپانیا زەبەلاحەکانـی ووزە و بانکـە بەناوبانگەکان و کارگەکانـی دروسـت کردنی چـەك و تەقەمەنی و کارگەکانـی دەرمان و زانکۆ بەناوبانگەکانـی جیهـان و کەنـاڵ و ڕاگەیاندنە بەهێزەکان سـەر بـە ئەمانن!!؟

دەوترێـت ئەم سـیانزە خانەوادەیـە دووانزەیان لە خانـەوادەی کوڕەزاکانی نـەوەی ئیسرائیلن، سـیانزەیەمین خانـەوادەش خانەوادەیەکی تـری جوولەکەیە کە کـەس نازانێت کێن؟؟؟

دروشـمی نورانیـەکان (هـەرەم) ێکـی سێگۆشـەیە، هەروەهـا لـەلای ماسـۆنیەکانیش سێگۆشـە ڕەمزێکـی زۆر گرنگـە.... ئـەو هێمای سێگۆشـەیە ئاماژەیـە بـۆ سـێ کاری گرنگ:

١. دژایەتی و تێکشکاندنی کەنیسەی کاثۆلیکی ڕەمزی مەسیحییەت .

٢. دامەزراندنی یەك حکومەتی جیهانی.

٣. سـەری سێگۆشـەکە یـان هەرەکەمـە چاوێکـە ئەمـەش ئاماژەیـە بۆ دروسـتکردنی تۆڕێکـی هەواڵگریی و سـیخوڕی زۆر بەهێز بـۆ جێبەجێکردن و پاراسـتنی ئەو ئامانجانە.

ئەنجوومەنـی بـاڵای نورانییـەکان لـە سـیانزە ئەنـدام پێکدێت، پاشـان ئەنجوومەنـی جێبەجێکردن دێت کە پێك دێت لە سـێ و سـێ ئەنـدام. (ئادەم وایزهاوبـت) بە یەکێك لـە دامەزرێنەران و کەسـە زۆر بەهێزەکانـی ڕێکخراوی نورانیـەکان دادەنرێـت، ناوبـراو دامەزرێنـەری ڕێکخراوەکەیـە، هەروەها لە پشـت دامەزراندنـی ڕێکخـراوی (مێزی خـڕ)ە لـە ئینگلتـەرا، ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانـی ئەمریـکا، ئەنجوومەنـی کارگێـڕی فیدڕاڵی ئەمریکا، لەپشـت دامەزراندنـی حیزبی شـوعی یەوەیە لەووڵاتی ڕووسـیا، ڕێکخراوی (جسـتابو) ی سـیخوڕی و نهێنی لە ووڵاتی فەڕەنسـا.

ڕێکخـراوی نهێنی(جسـتابو) ڕۆڵێکـی سـەرەکی هەبـوو لە سەرخسـتنی شۆڕشـی فەڕەنسـی؟؟؟ دروشـمی ئەم ڕێکخراوە نهێنی یە ئەوەبوو (کارەکانمان،

پیـــلان گێڕییەکانمـــان دەبێت بـــە ســـەرکەوتووی ئەنجـــام بدەین).

لێرەدا پێویســـتە ئاماژە بە خاڵێك بکەیـــن: نورانیەکان بە تـــەواوی هەموو ئایین و مەزهـــەب و فکرەیـــەك ڕەتدەکەنەوە و شـــەیتان پنتـــی هێزە لەلای ئـــەوان؟؟؟ بـــەڵام ماســـۆنییەکان ڕێکخراوێکـــی نهێنـــی جوولەکەیـــە و (هیـــرۆدس ئەگریبا) لەســـاڵی ٤٤ز دروســـتی کردووە، ناوبراو پاشـــایەکی ڕۆمانی بووە و بە هاوکاری دوو ڕاوێـــژکاری خۆی کە جوولەکـــە بوون بەناوەکانـــی (حیران ئابیود) جێگری پاشـــا و، (موئـــاب لامی) ڕازگری نهێنییەکانی پاشـــا ئـــەم ڕێکخراوەیـــان بنیاتناوە[17].

ئـــەم دوو ڕێکخـــراوە زەبەلاحە لە کۆنگـــرەی (فیلمس باد) لەســـاڵی ١٧٨٢ز [18] یەکیان گرت و ئامانج و ســـتراتیژەکانیان یەکخســـت.

لـــە ئێســـتادا ڕێکخـــراوی ماســـۆنیەکان زیاتر باڵادەســـتە و دەیـــان ڕێکخرا و دەســـتەی جـــۆراو جۆریان لە سەرتاســـەری جیهانـــدا هەیە لە زۆربـــەی ناوەندە زەبەلاحەکانـــی ڕاگەیاندن و بانکـــە جیهانییەکان و دەزگا ســـیخوڕی و هەواڵگرییە جیهانییـــەکان و لـــە ناوەنـــدی بڕیـــاردان لـــە زۆربـــەی وولاتـــە زلهێـــزەکان و، لەســـەرجەم ڕێکخراوەکانـــی نەتـــەوە یەکگرتووەکانـــدا هەن، بـــەڵام نورانیەکان بە شـــێوەی ڕێکخـــراوی جۆراوجۆر لە هەندێـــك وولاتدا هـــەن بەتایبەت هەردوو وڵاتـــی ئەمریـــکا و بەریتانیـــا هەروەهـــا دروشـــم و سرووتـــی ئایینی شـــەیتان پەرســـتی خۆیـــان هەیە و ئەنجامـــی دەدەن، هەنـــدێ جار و ناوبەنـــاو لە وولاتە ئیسلامییەکانیشـــدا بەدەردەکەون و چالاکـــی ئەنجام دەدەن؟ ئـــەوەی لەوولاتی میـــسر ڕووی دا لەم ســـاڵانەی دوایدا جێگەی پرســـیارە!!

پۆلیســـی وڵاتی میـــسر ڕایگەیانـــد کە چەند کەســـێکیان دەستبەســـەرکردووە خەریکـــی ئەنجامدانـــی جـــۆرە پەرســـتێکی شـــەیتانی بـــوون، لەنـــاو دەستبەســـەرکراوەکاندا خوێنـــدکاری زانکۆ و هونەرمەند و کەســـانی سیاســـی و نووســـەر دەبینران؟!

---

١٧ کتێبی (موسوعة الميسرة فی الاديان والمذاهب المعاصرة) بەشی یەکەم _ لاپەرە ٥١٠.

١٨ (٢) : کتێبی (أحجار على رقعة الشطرنج) - ولیەم جای کار.

لە ڕۆژئاواش شـــەیتان پەرســـتەکان زۆر ناسراون و ســـەنگ و پێگەی سیاســـی و ئابـــووری و هونـــەری و بیرمەنـــدی خۆیان هەیە، شـــوێن و پەرســـتگە و یانەی تایبـــەت بـــە خۆیـــان هەیـــە و پەرســـتنەکانیان تێـــدا ئەنجـــام دەدەن. یەکێك لەو پەرســـتنە ســـەیر و ترســـناکانە ســـەربڕینی منداڵێکـــە لە شـــەودا و کردن بە قوربانییەتـــی بـــۆ شـــەیتان؟؟؟ ئـــەم کۆبوونەوەیـــە بەشـــەو ئەنجـــام دەدرێت بـــە ئامادەبوونـــی کۆمەڵێـــك شـــوێنکەوتووی سەرســـەختی شـــەیتان، دواتـــر خواردنـــەوەی خوێنەکەیەتـــی لەلایـــەن ئامادەبووانـــەوە؟؟؟ بـــە گومانی خۆیان دەڵێن شـــاژنی تاریکی لەم ڕێوڕەســـمەدا ئامادەدەبێت (Queen of darkness) .

زەمینـــەی کارکردنی ڕێکخراوە (نورانیەکان و ماســـۆنیەکان) لـــە وولاتە هەژار و ئیســـلامییەکاندا زۆرترە لەبەر هـــۆکاری بڵاوبوونەوەی هـــەژاری و نەخوێندەواری و بێـــکاری و ســـتەمی سیاســـی و گەندەڵی و نادادپـــەروەری و هتـــد..... هەموو ئـــەم دیاردانـــە ڕێخۆشـــکەرن بـــۆ بڵاوبوونەوەیـــان و ئەنجامدانـــی چالاکـــی و پەیوەندیکردنـــی گەنجانـــی ئەو وولاتانـــە بـــە ڕێکخراوەکانیانەوە کـــە بە دەیان ناوی جۆراوجـــۆرەوە چالاکی ئەنجـــام دەدەن.

ئـــەم دوو ڕێکخـــراوە مەترســـیدارە ســـەرجەم کارەکانیان بە شـــێوەیەکی زۆر نهێنـــی ئەنجـــام دەدەن یان لە ژێـــر نـــاوی ڕێکخراوەکانی تایبـــەت بە(ئافرەتان، لاوان، هونـــەر و تیپە هونەرییـــەکان و مافەکانی مرۆڤ و هتـــد....)، هیچ وولاتێك و دەزگایـــەك نازانێت ئامانجی ســـەرەکی لە پشـــت کارەکانیانـــەوە چییە؟ ئەوان گەورەتریـــن هێزیان لە نهێنی پاراســـتندا دەبیننەوە... نووســـەر (فریدز ئیســـبەر نغمایـــەر) دەڵێت: ئـــەو خانەوادانەش لـــە ئەوروپـــا و ئەمریکا ئـــەم ڕێکخراوە بەڕێـــوە دەبەن هیچ کەســـێك زانیـــاری لەبارەیانـــەوە نازانێت؟؟

ئەمانـــە زۆر مەترســـیدارن، نورانیـــەکان و ماســـۆنیەکان لـــە دوای جەنگـــی جیهانـــی دووەمەوە بە تەواوەتی دەســـتیان بەســـەر وولاتی ئەمریـــکادا گرتووە، ئەوان دەســـتیان بەســـەر ســـەرجەم پارتە گـــەورە و بچووکەکانی ئـــەو وولاتەدا گرتـــووە، هەرچـــی هۆکارەکانـــی ڕاگەیاندن هەیـــە لەژێر هەژموونـــی ئەواندایە،

سەرمایەگوزاری لە سامان و دراو لەلایەن ئەوانەوە هەڵدەسوڕێت؟

خاوەنی کتێبی (لە پێناو دیکتاتۆریەتی جیهانی جوولەکەدا) دەڵێت: دراوی دۆلاری ئەمریکی دراوێکی جوولەکەیە؟ لەسەر ڕووی ئەم دراوە هێما و وێنەی کەسایەتییەکانیان دەبینرێت، ئامانجیان دروستکردنی فەرمانڕەوایەتییەکی جیهانییە و لەو پێناوەشدا بەرەو بەم دراوە دەدرێت. هەروەها نووسەر لەم کتێبەدا شتی سەیر دەڵێت لەوانە: گروپێك لە زانایان و دەریاوانانی ئەمریکی بەسەرۆکایەتی ژێر دەریا گەڕ (ئابیل گلانتەر) لەناو زەریای ئەتڵەسیدا لەناچەی سێگۆشەی بەرمۆدا دا (هەرەم) ێکیان لە دووری (٨٠) کم لە باشووری ویلایەتی فلۆریدا دۆزیوەتەوە، درێژی ئەم هەرەمە (١٨٠) م دەبێت، دوای پشکنین و گەڕان بە وردی بەناو ئەم هەرەمەدا بە ئامێری زۆر ورد و پێشکەوتوو زاناکان بۆیان دەرکەوت کە لەناو هەرەمەکەدا فڕۆکە و کەشتی و کەل و پەلی زۆر پێشکەوتوو، لاشەی مردووی مۆمیاکراو، چەند پارچە نووسینێکی هیرۆگلیفی یان دۆزیوەتەوە!!

زاناکان دەڵێن ئەم کەرەستە و شتومەکانە یان پاشماوەی شارستانیەتی (ئەتڵانتس) ە یان کەلوپەل و کەرەستەی بوونەوەرە ئاسمانیەکانن!؟

زاناکان دەڵێن لە ترسی کاردانەوەیان ناوێرین دەست لەم کەرەستانە بدەین، نووسەر دەڵێت: دوای ئاشکرابوون و دۆزینەوەی پارچە نووسینە هیرۆگلیفییەکان گەورە حاخامەکانی جوولەکەکان کۆبوونەوە و بڕیاری دروستکردنی (کۆمەڵگەی نورانی) یان دا و، ئەوەیان ڕاگەیاند کە تەنها ئیمەی جوولەکە دەتوانین لە دەق و نووسراوە کۆنە پیرۆزەکان بگەین؟!

نهێنی و پەنهان و نادیاری باڵی بەسەر کارەکانی ئەم ڕێکخراوانەدا کێشاوە(نورانیەکان، ماسۆنیەکان) ئامانجی نادیار و پلانی ورد و داڕێژراو هەروەها کەسانی نەناسراو لە پشت کارەکانیانەوەن؟؟ بەبەردەوامی و لە هەموو سەردەمەکاندا مرۆڤایەتی سەرقاڵ دەکەن؟ ئێستا دەرکەوتووە بڵاوبوونەوەی ڤایرۆس و زۆربەی نەخۆشیە گواستراوەکان وەك (سارس، ئەنفلۆنزا

بە هەمــــوو جۆرەکانیــــەوە، شــێرپەنجەکان، ئایدز، شـــەکرە) ئـــەوان ئەنجامیان داوە؟؟، داڕووخانـــی بۆرســـە و بانکـــەکان بـــە درێژایی مێژوو کاری ئـــەوان بووە. ســـەرقاڵ کردنـــی جیهان بـــە هەنـــدێ پێشـــکەوتنی زانســـتی و کارە بیردۆزەییە نەســـەلمێنراوەکان، زانیارییە تەندروســـتییەکان (ڕۆژێك ئەم خواردنە تەندروســـت و باشـــە ڕۆژێك خواردنێکی تر تەندروســـت و باشـــە).

لـــە بـــواری هونـــەری سـینەما و بەرهەمـــە هونەرییـــە تەلەفزیۆنیـــەکان، تەنانـــەت زنجیرە کارتۆنیـــەکان (زنجیـــرە کارتۆنەکانی دیزنی، سیمپســـن، گامبۆڵ، کارتۆنەکانـــی کەناڵی کارتون نێتوۆرك، ئامانجیان شـــێواندنی جیهانـــی منداڵانە بە تێکـــڕا ئەو زنجیـــرە کارتۆنییانە زۆر دیاردەی نەشـــیاو فێری منـــداڵان دەکات وەك پیلان گێـــڕی و بڵاوبوونەوەی شـــەڕانگێزی و تـــرس و تۆقاندن و ژیـــان لە خەیاڵ و فانتازیـــا دا بەســـەر بردن، هەموو کەســـێك کـــردن بە دوژمنی خـــۆت.... هتد. هەروەهـــا بۆ گەنجـــان و لاوان هەمیشـــە لە هەوڵـــی دروســـتکردنی کێبڕکێ و ململانێـــدان لە نێوان هـــەردوو ڕەگەز، کارکردن لەســـەر بەرنامـــە جێندەرییەکان بـــۆ ئافرەتـــان وە هاندان بۆ بەســـەربردنی ژیان بە شـــێوەی ســـینگڵی و تەنهایی.

هەر لـــە بواری هونەر و ســـینەمادا تێکڕای فلیـــم و دراماکانیـــان یارمەتیدەرە بـــۆ بڵاوەپێکردنی توندوتیـــژی (بە هەموو شـــێوازەکانیەوە)، ئاســـان بەکارهێنانی چـــەك و تەقەمەنـــی لەلایـــەن هەمـــوو تەمەنێکەوە،ڕەواییـــدان بـــە چەندین شـــێوازی دزیکردن لەنـــاو کۆمەڵگادا.

لـــە هەمووی مەترســـیدار تر ســـەرقاڵکردن و سەرلێشـــێواندنی هەموو جیهانە بەوەی کە لە ئاســـمانەکان بوونەوەری ئاســـمانی هەن و جارجار دێنە ســـەر زەوی و داگیری دەکەن.

کۆتا کاری هونەری نەشـــیاویان زنجیرە درامای (The Hundred) ســـەد کەسەکە، چەنـــد وەرزێکی لـــێ بەرهەمهێنراوە و لەم زنجیرەیەدابە ئاشـــکرا بـــاس لەوە دەکات کـــە ووڵاتە زلهێزەکان دەبێت بە شـــەڕیان و جەنگی ناوەکی ڕوودەدات و ســـەرزەوی وێـــران دەبێت و هیچ مـــرۆڤ و زیندەوەرێك لەســـەر ڕووی زەوی نامێنێت.... دواجار

لــە ڕێگای چەند وێســتگە و کەشــتی ئاســمانی زۆر پێشــکەوتووەوە چەند هەزار کەســێك لەناو ئەم کەشــتیانە و لە ئاســمان دەپارێزرێن و لە کۆتاییدا دێنەوە ســەر زەوی بۆ سەرلەنوێ دەســتپێکردنەوەی ژیان...

بە نهێنــی و زۆر بــە وردی کار بۆ کەمکردنــەوەی ژمارەی دانیشــتوان دەکەن لەســەر ئەم هەســارەیە بــە هەڵگیرســاندنی جەنگــی زۆر گــەورە وەك جەنگی (یەکــەم و دووەم) ی جیهانی، بڵاوکردنەوەی دەیان نەخۆشــی مەترســیدار و هتد...

بیرۆکــەی هەڵگیرســاندنی جەنگــە کاولــکارە کۆنــەکان، جەنگەکانی ڕۆمان و یۆنانــەکان، وە لەناوبردنــی کتێبخانــە مێژووییــە کۆنــەکان وەك کتێبخانەی ئەســکەندەرییە.... کتێبخانــەی (بیرغامــوس) لە ئاســیای بچووك کــە نزیکەی دووســەد هەزا کتێبی زۆر بەنرخــی تێدابــووە، لەناوبردنی کتێبخانــەی (قرتاج) لــە وولاتــی تونس لەلایــەن ڕۆمانــەوە کــە نزیکەی پێنــج ســەد هەزارکتێبی تێدابــووە، هەموو ئەمانــە لە پێنــاو لەناوبــردن و لەبەین بردنی ئــەو میراتییە زانســتی و ڕاســتییە مێــژووی و جوگرافی و فەلەکناســی و پزیشــکی یە بووەکە مرۆڤایەتــی بەدەســتی هێناوە بۆ ئــەوەی مرۆڤــەکان لە ناجێگیــری و نائارامی دەروونــی و نەبوونــی پاڵپشــت و کۆڵەکەیــەك کە پشــتی پێ ببەســتن و ژیان بەســەر ببــەن...... بێگومــان هەمــوو ئەمانەش شــەیتان لە ڕێگەی کەســانی خــۆی و دواکەوتووەکانی بە بیــلان و پلانی زۆر ورد ئەنجامــی دەدات....بێگومان ســەرچاوەی ئەمــەش دەگەڕێتەوە بــۆ ئەو ململانــێ ئەزەلییەی کــە ڕووی داوە لە نێــوان خــودای میهرەبان و یەکتاپەرســتی لەلایــەك، شــەیتان و یاخی بوون لە لایەکی تــر... وە ئەو مۆڵەت پێدانــەی کە خودای میهرەبان پێیــداوە تاکۆتایی ژیــان، شــەیتان و دەســت و پێوەندەکانــی بــەردەوام دەبن لــە گومڕاکردن و کاولــکاری و هەڵگیرســاندنی جەنگــەکان و لەناوبردنی زانســتە ســەلمێنراوەکان و لەبــری ئەوە ڕەوایی دان بــە بیردۆزە زانســتییەکان، تێکدان و شــێواندنی بیر و بــاوەڕی یەکتاپەرســتی و مێــژووی ئایینەکان، لەبــری ئەوە بــرەودان بە ئاینزا دەســکردە مرۆڤییەکان هتد...

خودای میهرەبـــان دەفەرموێت: **وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (٣٤) وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ * وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ * وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ (٣٦). (البقرة).**

ڕاڤـــەی ئایەتەکە: کاتێك بە فریشـــتەکانمان وت ســـوژدەی ڕێز بەرن بـــۆ ئادەم، بە فەرمانی خـــودا فریشـــتەکان هەموو ســـووژدەیان بـــرد تەنها شـــەیتان نەبێت خۆی بە گـــەورە زانی و چووە ڕیزی کافرانەوە، پاشـــان وتمان ئەی ئادەم خۆت و هاوســـەرت لەم بەهەشـــتەدا ژیان بەرنەســـەر و نیشـــتەجێبن لە هـــەر کوێ حەزدەکـــەن بخۆن و بخۆنـــەوە بـــە تێر و تەســـەلی، بـــەڵام نزیکی ئـــەم درەختـــە مەکەون(درەختێکی دیاریکراو بـــۆ تاقیکردنەوە لێیـــان قەدەغەکرا) ئەگینـــا دەچنە ڕیزی ســـتەمکارانەوە، شـــەیتان فرســـەتی لیهێنـــان و لـــە خشـــتەی بـــردن(وای لێکـــردن لـــە بەروبوومی درەختـــە قەدەغەکراوەکـــە بخۆن) و لەو شـــوێنە (پڕ لە خۆشـــی و نـــاز و نیعمەتە) بـــە دەرکردنـــی دان، ئەوســـا پێمان وتن: (مـــادام ســـەرپێچیتان کرد ئیتر لێـــرە جێتان نابێتـــەوە)، دەبێـــت دابەزنە خوارەوە بۆ ســـەر زەوی جا (لـــەوێ) هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانـــن (شـــەیتان دوژمنـــی ئێوەیە و بـــەردەوام هـــەوڵ دەدات دوژمنایەتی لە نێوانتانـــدا بەرپابـــکات)، تا ماوەیەکـــی دیاریکراو نیشـــتەجێ دەبن لـــە زەویدا و لە ناز و نیعمەتەکانی ســـوود وەردەگرن و بەهرەوەر دەبن.(تەفســـیری ئاســـان_لاپەرە٦).

هەروەهـــا خودای گـــەورە دەفەرموێت: **قَالَ أَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ (١٤) قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ (١٥) (الأعراف)**

ڕاڤـــەی ئایەتەکـــە: شـــەیتان ووتـــی داواکارم کـــە مۆڵەتـــم بدەیـــت تا ئەو ڕۆژەی کە هەمـــوو نەوەی ئادەم زینـــدوو دەکرێنەوە. خودای گـــەورە فەرمووی بەڕاســـتی تۆ لە مۆڵەت دراوانیت. (تەفســـیری ئاســـان_ لاپـــەرە١٥٢).

پاشـــان شـــەیتان بڕیاری لەســـەرخۆی داوە کە بە هەموو شـــێواز و هۆکارێك دژایەتی مـــرۆڤ بکات.

**قَـالَ فَبِـمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُـمْ صِرَاطَكَ الْمُسْـتَقِيمَ (١٦) ثُـمَّ لَآتِيَنَّهُمْ مِنْ بَـيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِـنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَـمَائِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَـاكِرِينَ (١٧) الأعراف.**

ڕاڤـەی ئایەتەکـە: شـەیتان وتـی: بەهـۆی ئـەوەی کـە تۆ منـت گومڕا و سـەرگەردان کـرد، ئـەوە سـوێند بێت منیـش لە ڕێگـە ڕاسـتەکەدا بۆیان دادەنیشـم(لایان بدەم). پاشـان سـوێند بەخودا لەبەردەمیانەوە، لە پشتیانەوە و لەلای ڕاسـتیانەوە، لەلای چەپیانەوە بۆیـان دێم و (دونیایان لە لا خۆشەویسـت دەکـەم و گومانیـان دەربـارەی قیامـەت لەلا دروسـت دەکـەم) و وەنابینیت زۆربەیان سوپاسـگوزار بن. (تە فسـیری ئاسـان _ لاپـەڕە١٥٢).

## قۆرخکاری و دەست بەسەرداگرتنی بازاڕ، هەرەس پێهێنانی بۆرسە و ناوەندە دراوییەکان کاری لەپێشینەی جوولەکەکانە

لە کۆندا لە سـەردەمی پاشـای ڕۆمانی (یوسـتنیافوس )ی یەکـەم(٤٨٣-٥٦٥) کۆمەڵێ یاسـای دەرکـرد بۆ ڕێك کردنـی بازاڕ بەناوی (یاسـاکانی شـار ) لەنێو بەندەکانی ئەم یاسـایانەدا پاشـا ویسـتبووی سـنورێك بـۆ کارە نایاسـییەکانی جوولەکەکان دابنێـت، بازرگانە جوولەکـەکان بە کرێگیـراوی نورانیەکان بوون و هیچـی تر بۆ بەرژەوەندی ڕۆمانـەکان کاریان نەدەکرد، زۆر بە ووردی دەسـتیان بەسـەر بازرگانییـە جۆراوجۆرەکاندا گرتبـوو لەوانە: (بازرگانـی کۆیلایەتی و یانە لەشفرۆشـیەکان و بۆن و عەتر و خشـڵ و زێڕ و خواردنـەوە کهولیەکان).

ڕۆمانـەکان لە نێوان سـاڵەکانی (٣٣٥-٣٨٤) دا زۆر یاسـایان دژی جوولەکەکان دەرکردبـوو بە مەبەسـتی ڕێگریکردن لـە دەسـت تێوەردانـە داراییەکانیان لە نێـو بـازاڕدا کە ببوە مایـەی مایەپـووچ بوونـی زۆر بازرگانی تر کـە جوولەکە نەبـوون!! لـە سـەردەمی پێغەمبەرایەتـی (عیسـا) سـەلامی خودای لەسـەر بێـت، جوولەکـە (سـامیەکان) کـە لە بنەچـەدا نـەوەی پێغەمبـەر یەعقوب بـوون (سـەلامی خودای لەسـەربێت ) بـە تایبـەت سـەردارەکانیان (المرابون)

زۆر دژایەتـــی پێغەمبەر (عیســـا) و ئاینی مەســـیحیان دەکـــرد و پێیان دەووت پێغەمبـــەرە درۆزنەکـــە، بۆیـــە پێغەمبەر(عیســـا) زۆر ڕقی لێیان بوو و هێرشـــی دەکردە ســـەریان چونکە لە کڕین و فرۆشـــتندا ســـوو یان وەردەگـــرت..... هەندێ جـــار نـــاوی دەبـــردن بـــە پارەپەرســـتەکان، وەهەروەهـــا پێی دەوتن(شـــەیتان پەرســـتەکان) (گسك لێدەری شـــەیتان)؟؟؟

دواجار و لە کۆتاییدا لە کۆشـــکی هەیکـــەل و دەوروبـــەری دەری کردن و ووتە بەناوبانگەکـــەی فەرمـــۆو: (ئە مشـــوێنە جێـــگای بەندایەتی و خواپەرســـتی بوو، ئێـــوە واتە جوولەکـــەکان ئێرەتان کـــردە کونە ئەشـــکەوتی دز و جـــەردەکان)...... لێرەوە جوولەکـــەکان پەیمانیان بە خۆیانـــدا کە دژایەتییەکی ســـەختی ئەم ئایینەو پێغەمبەرەکـــەی بکەن و ڕێکخراوێکی نهێنـــی بەناوی (نورانیەکان) دروســـت بکەن و پیلانگێـــڕی زۆر گەورە دژی شـــوێنکەوتوانی ئەم ئایینە نوێیـــە ئەنجام بدەن.

مێژوونووســـی بەریتانی (ئیـــدوارد جیبـــۆن) (١٧٣٧-١٧٤٩) بە ڕوونی باســـی لـــە کاریگەرییـــە خراپەکانـــی بازرگانـــە جوولەکـــەکان و ســـەرانی گـــەورەی جوولەکـــەکان دەکات لـــە تیاچوون و ڕووخانـــی ئیمپڕاتۆریەتـــی ڕۆمانەکاندا، ئەو دەڵێت: (لادانە سێکســـی و ڕەوشـــتییەکان هـــۆکاری تیاچوونـــی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانـــی بـــوو) هـــەر ئەمەش بـــووە ناونیشـــانی کتێبەکـــەی کە تیایـــدا زۆر بە ووردی بـــاس لە هەمـــوو ئەو ڕەوشـــتە نەشـــیاو و سێکســـیانە دەکات کە لەناو کۆمەڵگـــەی ڕۆمانیـــدا تەشـــەنەی ســـەندبوو، هـــاوکات بـــاس لە قـــۆرخ کاری بازرگانـــی و بـــازاڕ دەکات، هەروەها (ســـینیکا)ی فەیلەســـوف و ئاشـــتیخواز کە پەوەرشـــیار و مامۆســـتای شـــازادە (نیرۆن) بوو، دەڵێت: زۆر هەوڵـــم دەدا بەر لە خراپەکارییەکانـــی ســـەرانی جوولەکە و قۆرخـــکاری و کارە نەشـــیاوەکانیان بگرم لەنـــاو ئیمپڕاتۆریەکـــەدا بەڵام بێ ســـوود بوو.

ســـینیکا دەڵێـــت: دواجـــار کارەکە زۆر ســـەختتر بـــوو کاتێـــك جوولەکەکان ئافرەتێکیـــان بەنـــاوی (یوبایـــا)[19] بـــۆ (نیـــرۆن) ی شـــازادە و قووتابیـــم هێنا و

١٩ (١): هەماز جیرۆك بۆ شا ئیسماعیلی سەفەوی کە دایکی جوولەکە بووە ئەنجامدراوە.

منتدى إقرأ الثقافي

ئەویــش زۆر بەدڵــی بــوو و هاوســەرگیری لەگەڵــدا کــرد، لێرەوە مــن توانام بەســەر شــازادە نیرۆن دا نەما کە دواتر دەبێتە هاوســەری و هەمــوو بڕیارێکی پــێ دەردەکات، تــا وای لێهــات ئیمپراتۆریەتەکەمــان ڕوخا؟!

لێــرەوە گەلانــی ئەوروپــا تووشــی نەهامەتــی و ســەرگەردانی و شــەڕ و شــۆڕی زۆرگە ورە بــوون کە بە (ســەدە تاریکەکان) ناسراوە، هەمــوو نەتەوەکان و گەلانــی ئەوروپــا تووشــی جەنگــی مــاڵ وێرانکەر بــوون لەوانــە جەنگی نێوخۆیی ئەڵمانیا لە نێوان پرۆتســتانت و کاثۆلیك و ئارثۆذۆکســەکان هەڵگیرســا، ٣٠ ســاڵی خایانــد (١٦١٨-١٦٤٨) کە بە ســاڵە ڕەشــەکان بەناوبانگــە و زەرەر و زیانێکــی زۆری لــە وڵات دا و، چەندیــن ملیۆن کەســیان لە یەکتری کوشــت؟

بەدرێژایــی مێــژوو جولەکــەکان بۆ پاراســتنی نەتــەوە و قــەوارەی خۆیان هەمــوو کارێکیان ئەنجام داوە، دەســتێکی باڵایــان هەبووە لــە بازرگانیکردن و دەســت بەســەرداگرتنی بازاڕە دراوییەکان و بــازاڕی زێڕ و زیــو و هتد... هەوڵی زۆریــان داوە دراوی تایبــەت بــە خۆیــان لێبــدەن، لەکاتی کنەوپشــکنیندا لە وڵاتانــی پۆڵۆنیــا و هەنگاریا چەنــد پارچە دراوێــك دۆزراونەتــەوە کە هێما و نووســینی یەهودی بەســەرەوە بــووە و مێژووی ئەم دراوانە بۆ ســەدان ســاڵ بەر لــە ئێســتا دەگەڕێتەوە.

لەســەردەمی ئێســتادا دراوی دۆلار کــە دراوێکــی وڵاتــی ئەمریکایە و لە جیهانــدا مامەڵــەی پێوەدەکرێــت و بــە دراوی خۆیانی دەزانن. هێــما و وێنەی کەســایەتییەکانی خۆیانیــان لەســەر نەخشــاندووە.

(ئامشــێل مایــر بــاوەر) (١٧٤٣-١٨١٢) دامەزرێنەری بنەماڵەی ڕۆتشــێڵدی جوولەکــە دەڵێــت: ئێمە دەبێــت دراوی تایبەت بــە خۆمان هەبێــت لە یەکێك لــە وڵاتەکانــی جیهانــدا و دواجــار گرنــگ نییە بەلامانــەوە کێ ئــەو وڵاتە بەڕێــوە دەبات.

مەســیحییەکانی ئەوروپــا زۆر زوو هەســتیان بــە مەترســی جوولەکــەکان کردبــوو بۆیە هەمیشــە لەبیــری نەخشــە و پلانێکدا بــوون بۆ ڕێگــە گرتن لە

پاوانخــوازی و پیلانگێڕیەکانیــان، لێرەوە هاتن بـــە بیانووی گەڕانـــەوە بۆ ناوچە پیــرۆزەکان و پاراســـتنی زیارەتـــکارە مەســـیحییەکان لەکاتـــی ســـەردانیکردنیان بـــۆ قودس و گـــۆڕی مەســـیح هەڵمەتـــی ســـەربازی زۆر گەورەیان ڕێکخســـت و دەســـتیان کـــرد بە هێرشـــکردن بۆ ســـەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســـت واتـــە وڵاتە ئیســـلامییەکان لەنێوان ســـاڵانی (١٠٩٥-١٢٧١) هەشـــت هەڵمەتی ســـەربازییان ئەنجـــام داوە کـــە ناسراوە بەشـــەڕی خاچ پەرســـتەکان.

دواتـــر دەرکـــەوت کـــە ئامانجی هـــەرە گـــەورە لە پشـــت ئـــەم هەڵمەتە ســـەربازییانەوە تەنهـــا بریتی بووە لە یەکخســـتن و بەهێزکردنی مەســـیحییەکانی ئەوروپـــا دژی جوولەکـــەکان، نیشـــاندانی جۆرێـــك لـــە پتـــەوی و یەکڕیـــزی مەســـیحییەکان بەرامبـــەر بە جوولەکـــەکان کە لەو ڕۆژانەدا دەســـتیان بەســـەر بانکـــەکان و ناوەنـــدە بازرگانییەکان و تەنانـــەت لەڕێگەی ئەو ســـامان و داهاتە زۆرە ی هەیانبـــوو کاریگەرییـــان بەســـەر بڕیـــاری سیاســـی زۆرێك لـــە وڵاتە ئەوروپییەکانـــەوە هەبـــوو.

ئـــەم هەڵمەتـــە ســـەربازییانە (هەڵمەتەکانـــی خـــاچ پەرســـتەکان) دەکرانە ســـەر وڵاتە ئیســـلامییەکانی ئەو کاتە وەك وڵاتانی شـــام (لوبنان و فەڵەستین و ســـوریاوئوردن) هەروەها وڵاتانی ڕۆژئـــاوای عەرەبی بەتایبـــەت وڵاتی (میسر)، ئـــەم هەڵمەتانـــە زەرەر و زیانێکی زۆری مـــاددی و مرۆی بەو ناوچانـــە گەیاند، دەکرێـــت بڵێیـــن مەســـیحییەکانی ڕۆژئاوا دەیانویســـت بەبەردێـــك دووچۆلەکە بکوژن.

لەســـاڵی ١٢١٥ ز کەنیســـەی کاثۆلیکی کۆنگـــرەی چوارەمی خۆی بەســـتبوو، تیایـــدا بە ڕوونی باســـیان لە دەســـت درێژییەکانی جوولەکەکان کردبوو، باســـیان لـــەوە کردبوو کە دەبێت ســـنوورێك بـــۆ کارەکانیان دابنرێت کە دواجار گەیشـــتنە ئەو بڕیـــارەی کە دەبێـــت جوولەکەکان لە هەنـــدێ گەڕەکی تایبـــەت بە خۆیان نیشـــتەجێ بکرێن و تێکـــەڵاوی کۆمەڵگەی مەســـیحی نەبن؟

یەکێکـــی تـــر لـــە بڕیـــارەکان بریتـــی بوو لـــەوەی کە بـــە هیچ شـــێوەیەك

منتدى إقرأ الثقافي

نابێــت ئافرەتانی مەســیحی لە شــوێن و ماڵــە جوولەکەکانــدا کار بکەن چونکە ئەگــەری ئەوەیــان لێدەکرێــت کە بــۆ کاری بەدڕەوشــتی بەکاریــان بهێنن.

لێــرەوە دەرکردنــی جوولەکــەکان لە زۆربــەی وولاتە ئەوروپیەکان دەســتی پێکرد!! وڵاتی فەڕەنســا لەســاڵی ١٢٥٣ز جوولەکەکانی هەموو بــە بڕیار دەرکرد لــە وولاتەکەی خــۆی، جوولەکەکانیش بــەرەو وولاتــی بەریتانیــا کۆچیان کرد، وولاتــی سەکســۆنیا لەســاڵی ١٣٤٨ز جوولەکەکانــی دەرکرد، هەنگاریا لەســاڵی ١٣٦٠ز جوولەکەکانــی دەرکــرد، بەلجیــکا لەســاڵی ١٣٧٠ز جوولەکەکانــی دەرکــرد، ســلۆڤاکیا لەســاڵی ١٣٨٠ز جوولەکەکانــی دەرکرد، نەمســا لەســاڵی ١٤٣٠ز جوولەکەکانــی دەرکــرد، هۆڵەنــدا لەســاڵی ١٤٤٤ز جوولەکەکانــی دەرکــرد، ئیســپانیا لەســاڵی ١٤٩٢ز جوولەکەکانــی دەرکــرد، لیتوانیا لەســاڵی ١٤٩٥ز جوولەکەکانــی دەرکــرد، پورتــوگال لەســاڵی ١٤٩٨ز جوولەکەکانــی دەرکــرد، ئیتاڵیــا لەســاڵی ١٥٤٠ ز جوولەکەکانــی دەرکــرد، باڤاریا[٢٠] لەســاڵی ١٥٥١ز جوولەکەکانــی دەرکــرد.

جوولەکــەکان وەك لــە ســەرەتاوە باســمان کــرد لــە چەنــد گەڕەکێکی تایبــەت بە خۆیان نیشــتەجێ دەکران، هەمــوو جموجۆڵێکیان ســنووردار دەکرا، لێــرەوە جوولەکەکان بە لێشــاو کۆچیــان کرد بــەرەو وولاتی بەریتانیــا، چونکە جوولەکــەکان لە وڵاتــی بەریتانیا خاوەن دەســەڵات و پارە و ســامان و چەندین بانك بوون.

پاشــا (هێــنری) پاشــای بەریتانیــا لەســاڵی ١٢٧٥ز بەهەمــان شــێوە کۆمەڵێك یاســای تایبــەت بــە جوولەکەکانی دەرکرد بــۆ ڕێگری کــردن لە کارە نەشــیاوەکانیان[٢١]. زۆرێکی تــر لە جوولەکــەکان بەرەو هــەردوو وولاتی پۆڵەندا و تورکیا کۆچیــان کرد.

---

٢٠ باڤاریا: وولاتی ئەڵمانیای ئێستا.

٢١ لە هەردوو کتێبی أحجار على رقعة الشطرنج) ولیەم جار کار.

- (حکومة عالم الخفیة)- سبیرو فتش.


منتدى إقرأ الثقافي

جوولەکــەکان هەوڵیانــدا لــە ڕێگــەی بیرمەندەکانیانەوە لەنــاو ڕێکخراوی نورانیــەکان و ماســۆنیەکان بــۆ ڕزگاربــوون لەو فشــارە زۆرەی کە لەســەریان بــوو دەســتیان کــرد بــە پیلانگێــڕی و دروســت کردنــی ئاڕاســتە و پارتــی ســیکیولاریزمی(عەلمانی) بۆ ڕووبەڕوبوونــەوەی بیر و بۆچوونی مەســیحییەکان، هاوکات لــەو گەڕەکــە تایبەتانەی کــە تیایدا نیشــتەجێکرابوون بــە زۆرەملێ، ســەرانی جوولەکــە و نورانیــەکان بەبەردەوامــی ســەردانیان دەکــردن و بیری تۆڵەســەندنەوەیان تیایانــدا دەچانــد؟!

هەمیشــە پێیــان دەوتــن (ئێمــە گەلــی هەڵبــژاردەی خودایــن) ئــازاد دەبیــن لــەم ناوچانــە و دەگەڕێینــەوە شــار و شــارۆچکەکانمان. کۆمەڵێك لەو جوولەکانــەی کە پێیــان دەوتــرا جوولەکــەی (خەزەر) لــە ڕۆژئــاوای وڵاتی ڕووســیا لــە کەناراوەکانی دەریــای بەڵتیك نیشــتەجێ کرابــوون، زۆر توندڕەو و قیــن لە دڵ بــوون و بــە کارە نەشــیاوەکانیان ناسراوبوون، هەمیشــە لە بیری تۆڵەســەندنەوەدا بــوون لە شانشــینی ڕووســیا! دواجــار هەمــوو پیلانەکانیان کۆکردەوە و هاوکاربوون بۆ هەڵگیرســاندنی شۆڕشــی ئۆکتۆبــەری ١٩١٧ی زایینی واتە ســەرهەڵدانی (کۆمۆنیســت).

لێــرەوە دەردەکەوێت کــە نورانیــەکان بــۆ دژایەتیکردنی مەســیحییەکانی ڕۆژئــاوا پەنایــان بردۆتــە بــەر هەڵگیرســاندنی شــۆڕش لــە دژی زۆرێــك لە وڵاتەکانــی جیهــان، وە بڵاوەپێکــردن و ڕەوایــی پێــدان بــە بیــر و بۆچوونی سیکولاریســتی و دروســتکردنی چەندیــن پارتــی عەلمانی.



## پیلانە جیهانییەکانی نورانیەکان و فراوانبونیان

لەسـالّی ١٧٧٠ ز بیرۆکەی دروسـتکردنی (کۆمەڵگەی شـەیتان)ی لەسـەر دەسـتی کۆمەڵێـك شـەیتان پەرسـت لـە جوولەکەکان کـە پێیـان دەوترا (فریسـین)، (ڕەببانییـەکان) واتە (سەردەسـتە و پیاوە ئاینییـە گەورەکانیان) کـە حاخامـی زۆر گـەورەی تێـدا بـوو دروسـتکرا، هەروەها پێـی دەوترا (کۆمەڵگـەی نورانـی) یـان (ئەلیۆميناتـی) واتـە هەڵگـری ڕووناکـی یان (بوونـەوەری زۆر ڕوونـاك)، ووشـەی نورانـی (Lucifer) لوسـیفر بە واتای هەڵگـری ڕووناکـی دێت.

(بایـك)[22] لـە نووسـینێکیدا لە بـەرواری ١٤ی تەممـوز لە سـالّی ١٨٨٩ بۆ سـەرۆکەکانی ئەنجوومەنـە بـاڵاکان دەڵێـت: ئێمە دەبێـت لەنـاو خەڵکیدا بڵێـن باوەڕمان بە خـودا هەیە و دەیپەرسـتین، بـەڵام ئەو خودایـەی کە ئێمە دەیپەرسـتین جیایە لـەو خودایەی کە خەڵکـی دەیپەرسـتێت، خوداوەندی ئێمە (ئەدۆنـای)ەو شـەیتانە واتە (ئیبلیـس) کە کوڕی گـەورەی ئەدۆنایـە ئەویش شانبەشـانی ئەدۆنـای خوداوەنـدە، ئیبلیـس توانـی شـۆڕش بەرپا بـکات لە ئاسـمانەکان، ئیبلیس(شـەیتانی گـەورە) ئـەوە خوداوەندی ڕووناکـی و نوورە بـەڵام ئەدۆنـای خوداوەنـدی تاریکـی و شـەڕە؟؟ هەروەها (میخائیـل) برای ئیبلیسـە و ئـەو پیلانەکەی شـەیتانی ئاشـکرا کـردووە، وە هـەر ئەویش ناوی خۆی ناوە عیسـا و هاتۆتە سـەر زەوی بۆ ئەوەی چاکسـازی بـکات وەك ئەوەی کـە لە ئاسـمانەکان کردی بـەڵام سـەرکەوتوو نەبـوو؟؟ با ڕوون بێـت لەلاتان هەرچـی ڕووح و گیانـەکان هەیە ڕزگاری نابێـت هەتا ڕۆنەچێت لـە ئەوپەڕی خراپـەکاری و تاوانکاریدا[23]؟! هەروەها لـە نامەکەی دا دەڵێـت: دەبێت هەموو ئەندامێکی نـوێ تێبگەیەنرێـت و فێربکرێت کە شـەیتان خوداوەنـدی ئێمەیە و هاوتـای (ئەدۆنای)ە؟

---

٢٢ سەرۆکی ڕووحی و بەپرسی نورانیەکان.

٢٣ احجار علی رقعة الشطرنج. ولیەم جە ی کار.



منتدى إقرأ الثقافي

لــەم ڕوانگەیــەوە کۆمەڵــەی نورانیــەکان کاری لــە پێشــینەیان بریتی بووە لــە ڕووخاندنــی حکومەتــەکان و لەناوبردنــی هەمــوو ئاینــەکان و (ئایینــە ئاســمانییەکان) وە لەبری ئەوە زیندووکردنــەوەی ئایینزاکان و ئایینە دەســتکردە مرۆییەکان و بــرەو پێدانیان هاوکات لاوازکردنی حکومــەت و دەوڵەتە بەهێزەکان بــە زیندووکردنەوەی کێشــە ی کەمینەکان (الاقليــات العرقيــة) وە هاندانیان بۆ جیابوونــەوە و زیندووکردنــەوەی شــێوەزارە کۆنــەکان، وە هەڵدانەوەی کێشــە ســنوورییەکان لەنێــوان وڵاتەکانــدا؟؟ پاشــان پرچەککردنــی ئــەو وڵاتانە و بەگژدایەکترکردنیــان و لە کۆتاییــدا لاوازکردنیان و بەهەدەردانی ســامانی مرۆیی و ئابــووری ئەو وڵاتانــە و ملکەچ کردنیــان بۆ هەمــوو بڕیارێك .

ڕووداوەکانــی مێژوو دەرخــەری ئەو ڕاســتییەن کە جوولەکەکانــی (خەزەر) لە پشــت ڕووخاندنی قەیســەری ڕووســیا و هەڵگیرساندنی شۆڕشــی ئۆکتۆبەری ی ســاڵی ١٩١٧ ەوە بوون، هەڵگیرســاندنی شۆڕشــی فەرەنســی لەژێر دروشمی (ئــازادی و دیموکراســی) لەســاڵی ١٧٨٩ [٢٤]ز نورانیــەکان و جوولەکــەکان لــە پشــتییەوە بوون دژی دەسەڵاتی (پاشــا و کەنیســە)، دوای بەهێز بوونی هەردوو وڵاتــی (بەریتانیــا و فەرەنســا) وە تەواو بوونــی کارەکانیان بە پێی نەخشــەی نورانیەکان و جوولەکەکان، شــەڕێکی کاولــکاری درێژخایەنیــان لەنێوان هەردوو وڵاتدا هەڵگیرســاند کــە بوو بە مایــەی لاوازکردنی هــەردوو وڵات!! هەروەها هەڵگیرســاندنی هــەردوو جەنگــی جیهانی یەکــەم و دووەم بەهەمان شــێوە نورانیەکان لە پشــتییەوە بــوون..... ئامانجیان لاوازکردنی هەمــوو (جوویم)[٢٥]ێکە و پەرتەوازەکــردن و بڵاوەپێکردنــی دەیان نەخۆشــی جۆراوجۆرە؟

نورانیــەکان دەڵێــن ئامانجــمان یەك سیســتەمی جیهانی و یــەك حکومەتی

---

٢٤ لەساڵی ١٧٨٤ دا ئاز هاوبت پرۆژەی پلانی هەڵگیرساندنی شۆڕشەکەی بە کەسێکدا دەنێرێت بۆ فەرەنسا بەڵام ویستی خوا وادەبێت ئەو کەسە هەر لەناو وڵاتی (باڤاریا- ئەڵمانیا) هەورە بروسکە لێی دەدات و پۆلیس لەکاتی پشکنینی لاشەکەیدا ئەم پیلانە دەدۆزنەوە و ئاشکرادەبێت.

٢٥ جوولەکەکان بە هەموو نەتەوە و ئایینێکی تر جگە لە خۆیان دەڵێن (جوویم).

بەهێـــزە[٢٦] بێگومان ئـــەوەش دەبێت خۆمـــان بەڕێوەی ببەین یـــان هاوکارەکانمان، بـــۆ ئەو ئامانجـــەش دەبێت ڕێژەی دانیشـــتوانی گۆی زەوی کـــەم بکەینەوە؟؟.

لە کۆنـــدا تـــا کۆتایی ســـەدەی هـــەژدە وولاتـــی ئەڵمانیا بنکەی ســـەرەکی نورانیـــەکان بووە، بنکـــەی بەڕێوەبـــردن لەشـــاری فرانکفۆرت بـــووە، هەروەها خانـــەوادەی (ڕۆتشـــیڵد) کە بە بنەچـــە ئەڵمانین و دوای ئاشـــکرابوونی پلانەکەی (وایز هاوبت) ســـەبارەت بە هەڵگیرســـاندنی شۆڕشـــی فەڕەنســـا، بەرەو وولاتی بەریتانیـــا کۆچیان کردوو و بـــۆ ماوەیەك لەوێ نیشـــتەجێ بـــوون، دواتر وولاتی بەریتانیـــا بەجێدەهێڵـــن و ڕوودەکەنـــە وولاتـــی ئەمریـــکا پاشـــان خانەوادەی ڕۆتشـــیڵد و کۆمەڵێك لـــە نورانیەکان لە دوای ئـــەم ئاشـــکرابوونە بارەگاکانیان بە نهێنـــی دەگوازنەوە بـــۆ وولاتی ســـویسرا تا کۆتایـــی جەنگی جیهانـــی دووەم و وێـــران بوونی وولاتانـــی ئەوروپا لـــەوێ دەمێننەوە.

لەســـاڵی ١٨٣٠ز ســـەرۆکی نورانیـــەکان و ماســـۆنیەکان (ئادەم وایـــز هاوبت) کۆچـــی دوایی کرد، هەمـــوو ئەنجومەنی ماســـۆنییەکان بە مردنی ناوبراو تووشـــی شـــۆك بـــوون و دەستەوەســـتان مانەوە بـــۆ ماوەی چوارســـاڵ، تا لەســـاڵی ١٨٣٤ز ســـەرکردەیەکی نوێیـــان بەنـــاوی (مازینی) هەڵبژارد کـــە بە رەگـــەز ئیتاڵی بوو بۆ جێبەجێکردنـــی پیـــلان و نەخشـــەکانیان و ئەو کارانـــەی کە تەواویـــان نەکردبوو، ناوبراویش شـــەش ســـاڵ ســـەرکردایەتی کردن و دواجار و لەســـاڵی ١٨٤٠ کەسێکی تریان دیاریکـــرد بۆ ســـەرکردایەتی کردنیـــان بەناوی (ئەلـــبرت بایك).

ناوبـــراو جەنەڕاڵێکـــی خانەنشـــینی ســـووپای ئەمریـــکا بوو، کەســـێکی زۆر بێبەزەی بـــوو و چەندین تاوانـــی کوشـــتن و لەناوبردنی بۆ ناوچەکانـــی هیندییە ســـوورەکان ئەنجام دابوو.

بایك لـــە شـــارۆچکەی (لیتـــڵ ڕۆك ) نیشـــتەجێ ببـــوو لەنێوان ســـاڵەکانی (١٨٥٩-١٨٧١) زۆر بـــە ووردی ســـەرقاڵی خوێندنـــەوە و ڕاڤەکردنـــی بیر و ڕاکانی (ئادەم وایـــز هاوبت) بوو بۆ ئـــەوەی بەرنامە ڕێژی بکات بۆ ســـاڵانی داهاتوو....

٢٦ مەبەستیان دروستکردنی شانشینێکی گەورەی شەیتانە لەسەر زەوی.

منتدى إقرأ الثقافي

لـــە کۆتاییدا بەرنامـــە ڕێژییەکەی ئاشـــکراکرد کە بەم شـــێوەیەی خـــوارەوە بوو: دروســـتکردنی ســـێ بزووتنەوەی بێباوەڕی گەورە بـــەم ناوانە:

١ . کۆمۆنیستی. ٢. فاشیستی. ٣. زایۆنیستی.

کۆمۆنیســـتەکان شۆڕشـــی ئۆکتۆبەریـــان لەســـاڵی ١٩١٧ز[٢٧] ئەنجامـــدا و سیســـتەمی پاشـــایەتی قەیســـەری ڕووســـیایان رووخاندوو و زۆر بـــە خێرایی لە وولاتانـــی ئەوروپـــای ڕۆژهەلاتـــدا بلاودەبوونەوە.. فاشیســـتەکان وەکـــو بیرۆکە و ڕەگەزپەرســـتێتی نەتـــەوە لەهەرســـێ وولاتانی(ئەڵمانیـــا و ئیتاڵیـــا و یابـــان) گەشـــەی ســـەندوو و باوەڕی تەواویـــان بە ســـڕینەوەی هەمـــوو نەتەوەکانی تر هەبوو تا کار گەیشـــتە ئەوەی هـــەردوو جەنگی گەورەی جیهانیان هەڵگیرســـاند و زەرەر و زیانێکی بێشـــوومار یان لـــە مرۆڤایەتیدا.

زایۆنیســـتی بزووتنەوەیەکـــی جوولەکەیـــی بـــوو ڕێخۆشـــکەری دەکـــرد بۆ دروســـت کردنـــی دەوڵەتێـــك بـــۆ جوولەکـــەکان لەســـەر خاکی فەڵەســـتین... لێـــرەوە ئەوەی ویســـتیان لەناو وولاتـــە ئیســـلامییەکاندا ئەنجامیانـــدا بە وێنەی (دروســـتکردنی پارتـــە نیشـــتیمانییەکان، ئەنجـــام دانـــی کودەتا، دروســـتکردنی بزووتنـــەوەی ئافرەتـــان، هاندانـــی ڕۆژهەڵات ناس و ماســـۆنیەکان بۆ دروســـت کردنی گومـــان لە قورئـــان و فەرمووده و کەســـایەتی پێغەمبـــەر دروودی خوای لەســـەربێت، وە نووســـینی دەیان کتێبی نادروســـت و ناڕاســـت لـــەو بوارانەدا) هەموو ئـــەم کارانە کاریگـــەری خراپ و نەرێنییان لەســـەر وولاتانـــی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاســـت بەجێهێشـــت، وە گومانێکی زۆریان لەســـەر ســـەرجەم پیرۆزییەکانی ئایینی ئیســـلام دروســـت کرد کـــە هەندێکیان تـــا ڕۆژگاری ئەمڕۆش مـــاوە؟؟ لە هەمووی ســـەیرتر کـــە زۆر جێـــگای تێڕامانە بەرواری هەڵگیرســـاندنی شۆڕشـــی ئۆکتۆبەری ڕووســـیا و پەیماننامـــەی بلفۆر ســـاڵی ١٩١٧ز[٢٨]یە.

---

٢٧ لەساڵی ١٨٨٣ لەسەر بیر و ڕاکانی مارکس چەندین یەکێتی کار دروست بوون کە هەموویان جوولەکەکان لە پشتیانەوە بوون و دواجار لە شێوەی شۆڕشێکی جەماوەریدا ڕێکخران.

٢٨ تەماشای کتێبی (المذاهب المعاصرة و موقف الاسلام منها) د. عبدالرحمان عمیرة.

منتدى إقرأ الثقافي

# نورانیەکان سەرکردەکانی ماسۆنیەتن

- تێکەڵبوونی نورانیەکان لەگەڵ ماسۆنیەکان
- پیلانی نورانیەکان و ماسۆنیەکان بۆ دەست بەسەرداگرتنی جیهان




منتدى إقرأ الثقافي

## تێکەڵبوونی نورانیەکان لەگەڵ ماسۆنیەکان لە سەدەی هەژدەدا

لەساڵی (١٩٧٩ز)ەوە کۆمەڵەی نورانیەکان لە هەوڵدابوون بۆ چوونە ناو ڕێکخراوی ماسۆنیەکانەوە، بێگومان ئەوەش دوای ئاشکرابوونی پلانەکەی وایز هاوبت کە تیایدا زۆر بە ڕوونی داوای لە سەرانی نورانیەکان کردبوو بچنە ناو ماسۆنیەکانەوە.

نورانیەکان لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتووبوون و توانیان پۆست و پلە باڵاکان لەناو ڕێکخراوە ماسۆنیەکەدا بە دەست بهێنن و هاوکات توانیان جگە لە جوولەکەکانیش کەسانی تر بهێننە ناو ڕێکخراوەکەوە؟؟

مێژووی ماسۆنیەکان زۆر ڕوون نیە و لێڵی پێوە دیارە و کەمترین سەرچاوەش لەم بوارەدا هەیە. بە گوێرەی کتێبەکەی ولیەم جە ی کار (احجار علی رقعة الشطرنج) باس لە دوو مێژوو دەکرێت: یەکەمیان مێژووی دروست بوونیان دەگەڕێنێتەوە بۆ ٣٢٢ پێش زایین، دووەمیان دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی پاشای ڕۆمانی (هیرۆدس) لەساڵی ٤٣ز.

چیرۆکەکەش بەم شێوەیەیە: پاشای ڕۆمانی (هیرۆدس ئەگریبا) و دوو لە ڕاوێژکارە جوولەکەکانی بەناوەکانی (هیرام و لیڤی) لەگەڵ حەوت کەسی تر کە هەموویان جوولەکە بوون بڕیاریان دا ڕێکخراوێکی نهێنی دروست بکەن بۆ دژایەتیکردنی ئایینی مەسیحی.

پاشا هیرودس هەڵبژێردرا بە سەرۆکی ڕێکخراوەکە و (هیرام ئابیوت) بە جێگری ڕێکخراوەکە دیاریکرا شایەنی باسە ناوبراو ناوی ڕێکخراوەکەی پێشنیار کرد کە بریتی بوو لە (هێزی شاراوە)، هەروەها (مواب لیڤی) بە نهێنی پارێزی ڕێکخراوەکە و بڕیارەکانی و بەرپرسی دارایی دیاریکرا.

پاشا هیرۆدس جوولەکە نەبوو بەڵکو کەسێکی بێباوەڕ بوو بۆ قازانجی شانشینەکەی وای بەباش دەزانی لەگەڵ جوولەکەکان دەست تێکەڵ بکات و وە ئەم ڕێکخراوە نهێنییە دروست بکات.

(مایکل هاوارد) خاوەنی کتێبی (پارێزگاریکردن لە شتە شاراوەکان لە

مـــاوەی پێنج هەزار ســـاڵی رابردوودا) لەگەڵ جـــەی کار خاوەنـــی کتێبی (احجار علـــی رقعة الشـــطرنج) هـــەردوو نووســـەر لـــە کتێبەکانیانـــدا ئاماژەیـــان بەوە کـــردووە و دەڵێن ئـــەم زانیاریانەمـــان لەو دەستنووســـە کۆنـــەوە وەرگرتووە کە مێژووەکـــەی دەگەڕێتەوە بۆ ســـەدەی چـــواردە؟! ئەم دەستنووســـە بـــە زمانی عیبری(زمانـــی جوولەکـــەکان) نووسراوەتـــەوە و تیایدا باس لە دانیشـــتنە نهێنی و پلانەکانی ئـــەو نۆ کەســـەی ســـەرەتاکە ڕێکخراوەکەیان دامەزرانـــدووە دەکات.

دەستنووســـەکە چەنـــد دانەیەکی لەســـەر نووسراوەتـــەوە و لـــەلای ئەم نۆ کەســـە پارێزراو بووە، دواجار ئەم لەبەرگیراوانە (نوســـخە) دەســـت بە دەســـت باوك جێی هێشـــتووە بۆ کوڕەکەی و نـــەوە لە دوای نەوە پاراســـتوویانە، بێگومان ئـــەم دەستاودەســـت کردنە لەســـاڵی ٤٣ز تا ســـەدەی (حەڤدەهەم) بـــەردەوام بووە.

لەم مـــاوە دوور و درێژەدا هەشـــت نوســـخەی فەوتاوە و تەنهـــا یەك دانەی ماوەتـــەوە، ئـــەو دانەیـــەش کەوتۆتـــە لای(جۆنـــاس) ناوێکەوە ئەویـــش وەکو میراتـــی داویەتی بـــە یەکێك لە نەوەکانی بەنـــاوی (لۆرانس) کە لەســـاڵی ١٨٦٨ز لەدایك بووە و مەســـیحی بـــووە، (لۆرانس) ئەم نوســـخەیەی وەرگێڕاوەتە ســـەر زمانـــی ئینگلیزی و لەژێـــر ناوی کتێبێکـــدا بەناونیشـــانی (لەناوبردنـــی تاریکی، بناغەی ماسۆنیەت).

لەســـەرەتای کتێبەکـــەدا بـــەم شـــێوەیە دەدوێـــت و دەڵێـــت: ئەمـــە ڕاســـتیەکەیە من ناوم (لۆرانســـە)، کـــوڕی جۆرجم، کوڕی ســـاموێل، کوڕی جۆناس بـــە ڕەچەڵەك ڕووســـیم، نـــەوەی یەکێك لە خاوەن ئەم دەســـت نووســـەم، ئەم دەســـت نووســـە بە زمانی (عیبری) نووسراوەتـــەوە و جارێك وەرگێڕدراوەتە ســـەر زمانی (ڕووســـی) و لە کۆتاییـــدا وەرگێڕدراوەتە ســـەر زمانـــی (ئینگلیزی).

باپیرەم ســـاموێل دەڵێت: هیـــچ دەرفەتێکم بۆ نەڕەخســـا بـــۆ بڵاوکردنەوەی ئـــەم دەســـت نووســـە، هەروەها لە دەســـت نووســـەکەدا نـــاوی کۆمەڵێ کەس هاتووە کە لـــە بیری نوێکردنـــەوەی ڕێکخراوەکەدا بوون، لـــەو ناوانەش (جۆزێف

لێڤـــی)ە کە پێشـــنیاری گۆڕینی نـــاوی ڕێکخراوەکـــەی کردبوو بۆ ماســـۆنی[٢٩]، لە کۆتاییـــدا ئەم دەســـتەیە دانیشـــتنێك ئەنجامـــدەدەن و بڕیاری گۆڕینـــی ناوەکە دەدەن لـــە (هێزی شـــاراوە) بۆ (ماســـۆنی) لەبـــەرواری ٢٤ حوزەیرانی ١٧١٧ز.

لێرەدا بە پێویســـتی دەزانـــم گرنگترین بابـــەت کە لە دەستنووســـە کۆنەکەدا هاتـــووە باســـبکەم کە بریتیـــە لە یەکەم دانیشـــتنی پاشـــا (هیـــرۆدس ئەگریبا) لەســـاڵی ٤٣ز: لـــە ســـاڵی ٤٣ز پاشـــا (هیـــرۆدس ئەگریبـــا) بانگـــی ئەندامانی دادگای قودســـی کـــرد کـــە بریتی بـــوون لـــەم کەســـانە (ئادۆنیـــرام، جوهانان، یەعقـــوب ئابدۆن، ئەنتی باس، ســـۆلۆمان، ئاشـــاد ئابیـــا) لەگـــەڵ دوو راوێژکارە جوولەکەکـــەی بەناوەکانـــی (هیـــرام ئابیۆد، مـــواب لیڤی)، هەموویـــان پێکەوە لەنـــاو کۆشـــك و بەنهێنـــی دانیشـــتنێکیان ئەنجامدا..... لە دانیشـــتنەکەدا پاشـــا ووتـــی: بـــرا بەڕێزەکانم ئێـــوە بە تەنهـــا یارمەتیـــدەر و پیاوانی من نیـــن، بەڵکو ئێـــوە کۆڵەکەی گەلـــی جوولەکـــە و شانشـــینەکەی منن، لەم ســـاتە بـــەدواوە ئـــەم کۆمەڵەیە(نـــۆ کەســـەکە) دەبیـــن بـــە برا، ئـــەم دانیشـــتنەمان لەســـەر بناغـــەی برایەتییە... وە بیرتانی دەهێنمەوە کە لە ئێســـتادا کەســـێك بانگەشـــەی پێغەمبەرایەتـــی دەکات لەنـــاو ئێمـــەی نـــەوەی ئیسرائیل دا پەیدابـــووە و ناوی (عیســـا)یە، شـــوێنکەوتووەکانی ڕوو لە زیادبوون دەکەن.... کەســـێکی ئاســـاییە و بانگەشـــەی موعجیـــزە دەکات، ئەو مەســـیحەی کە لە(تەورات )دا باســـی هاتووە هێشـــتا نەهاتـــووە نابێت بهێڵیـــن کەس بـــاوەڕی پێبهێنێت.

دوای کوشـــتنی عیســـا پێغەمبەر ســـەلامی خـــودای لەســـەربێت جارێکی تر ئـــەم ٩ کەســـە بەنهێنـــی لە کۆشـــك کۆدەبنـــەوە و ئەم بـــاس و خواســـە لەنێو خۆیانـــدا دەکەن[٣٠]:

ئێمـــە ئەومان لەخاچ دا و کوشـــتمان و ناشـــتمان!!! پاســـەوانمان دانـــا بەدیار گۆڕەکەیـــەوە، دواجـــار لەگۆڕەکـــەی دیارنەمـــا؟؟ ئەمـــەش بوو بەهـــۆی زیاتر

٢٩ ماسۆنی واتە بیناتنەرە سەربەستەکان.

٣٠ بێگومان ئەم ووتانەش لەناو دەستنووسەکەدا تۆمارکراوە، سەرجەم دانیشتنەکانیان و بڕیارەکانیان لە تینووسێکدا تۆمار دەکرا و لەلایەن (مواب لیڤی) هوە دەپارێزرا.

منتدى إقرأ الثقافي

هۆگربوونـــی شـــوێنکەوتووەکانی بەڕێنماییەکانیـــەوە، هەرچۆنێـــك بێـــت ئێمە هەرگیـــز ڕازی نابیـــن میللەتەکەمـــان واتە (جوولەکـــە) هیچ ئایینێکـــی تر جگە لـــە (یەهودییـــەت) هەڵبژێرێت، ئێمـــە لە بـــاو و باپیرانمانەوە بۆمـــان ماوەتەوە دەبێـــت پارێزگاری لـــێ بکەین تا کۆتایـــی جیهان.

پاشـــان هەر نۆیـــان ســـوێندی وەفادارییان خوارد بـــەم شـــێوەیە: من(فڵانی کـــوڕی فڵان) ســـوێند دەخـــۆم بە کتێبـــی پیرۆز و شـــەرەفم بە هیچ شـــێوەیەك خیانـــەت لـــە براکانم نەکـــەم و نهێنـــی کۆمەڵەکەم بپارێـــزم و پابەنـــد دەبم بە بڕیارەکانیـــەوە و کار دەکـــەم بۆ زیادکردنـــی ئەندامەکانی، هەتا مـــردن دژایەتی شـــوێنکەوتووانی ئایینی مەســـیحی دەکـــەم، ئەگەر پێچەوانەی ئەم ســـوێندە کارم کرد هەشـــت براکەم بۆیـــان هەیە بەهەرشـــێوەیەك کـــە ئەوان بڕیاری لەســـەر دەدەن بمکوژن[٣١].

پاشـــا (هیرۆدس ئاگریپا) بـــەردەوام دەبێـــت و دەڵێت: دەبێـــت هەموو ئەو کەرەســـتە کۆنانـــە بەکاربهێنیـــن کە دارتاشـــەکان بەکاریـــان هێنـــا وەك (زاویە، قـــەوس، پرگال،....هتد) هەروەها چەکووشـــی لە دار دروســـتکراو کـــە هێمان بۆ دروستکردنی (کۆشکی ســـولەیمان). هەموو دانیشـــتنێکمان بە سێ جار پیاکێشانی چەکووشـــەکە دەســـت پێدەکەین کـــە ئاماژەن بۆ ئەو چەکووشـــەی (مەســـیح) مان پـــێ لەخاچ دا و ســـێ ئەســـتێرەکەش ئاماژەن بۆ ئەو ســـێ بزمـــارەی دامان کوتـــی بەدەســـتەکانی و قاچەکانیـــدا؟؟؟ پلەکانی کۆمەڵەکەمان (ســـی و ســـێ) پلەن ئامـــاژەن بۆ تەمەنی (عیســـای مەســـیح)، هـــەر پلەیەك ناوێکـــی تایبەتی بـــۆ هەڵدەبژێریـــن، دەبێت ئـــەم بیرۆکە و هێمایانـــە بیرۆکەی مـــن و براکانتانن (هیـــرام و مواب)ن بـــە نهێنی بمێننـــەوە تا هەمـــوو ئەندامان وابزانـــن مێژووی ئێمـــە دەگەڕێتەوە بۆ ســـەردەمی (ســـولەیمان) ئەمـــە پوختەی ووتەکەی پاشـــا (هیرۆدس ئاگریپـــا) بووە.

ئـــەم کۆمەڵەیـــە لەســـەرەتادا وای بەبـــاش دەزانـــی لەڕێـــگای چەنـــد

---

٣١ تبديد الظلام، أصل الماسونية. لۆرانس.


منتدى إقرأ الثقافي

جوولەکەیەکـــی بـــە توانـــاوە دزە بکەنە نـــاو مەســـیحییەکانەوە و، وا نیشـــان بـــدەن کـــە بـــوون بـــە مەســـیحی وە لـــەم هەوڵـــەش ســـەرکەوتوو بوون.

یەکـــەم کەســـی جوولەکە کـــە بەم کارە هەســـتاوە نـــاوی (شـــاول تەرتوس) بـــوو کە لەنـــاو ئایینی مەســـیحی دا بـــە (پۆلـــس) ی پێغەمبەر ناسراوە، شـــاول توانـــی پەیوەندی نێـــوان هـــەردوو ئایینی جوولەکـــە و مەســـیحی بپچڕێنێت و دەســـتکاری لە تەوراتی ســـەردەمی کۆندا بـــکات بۆ ئەوەی هیـــچ جوولەکەیەك کاریگـــەر نەبێـــت بـــە ئایینـــە نوێیەکـــە!؟ هەروەها توانیـــان بیـــر و بۆچوونی بتپەرســـتی و ســـێ خوداوەنـــدی بهێننە ناو ئایینی مەســـیحی یـــەوە و لە ڕێرەوە رووحیـــە پاکەکەی خـــۆی لایبدەن و ڕۆشـــنبیری و فەلســـەفەی یۆنانـــی تێکەڵ بکە ن .

پاشـــان لـــە ڕێگـــەی بازرگانەکانیانـــەوە دەســـتیان گـــرت بەســـەر زۆربەی بازرگانیـــەکان و جیهانی پـــارە لە زۆربەی وولاتەکاندا، ئەمەش مەترســـی لەســـەر ئابووری ئەو وولاتانە دروســـت کرد بە شـــێوەیەك زۆربەی وولاتە مەســـیحییەکان لەســـاڵی ١٢١٥ز کۆبوونەوە و کۆنگرەی زۆریان بەســـت بە مەبەســـتی ڕووبەڕوو بوونـــەوەی کارە مەترســـیدارەکانی جوولەکـــەکان و، تەنانـــەت دەرکردنیـــان لە وولاتەکانیان.

لەســـاڵی ١٢٧٥ز پاشـــا (ئێـــدوارد)ی ئینگلتـــەرا کۆمەڵێـــك یاســـای تایبەتی ســـەبارەت بـــە جوولەکـــەکان دەرکرد لەپـــای ئەو هەمـــوو دەســـت درێژییانەی دەیـــان کردە ســـەر بازاڕ و ســـەرمایە گشـــتییەکان.

زۆربـــەی وولاتـــە ئەوروپییـــەکان لەنێوان ســـاڵانی (١٣٠٦-١٤٩٢)ز دەســـتیان کردووە بـــە دەرکردنـــی جوولەکەکان لـــە وولاتەکانیانـــدا.....

دوای دەرکردنـــی جوولەکـــەکان لە وڵاتانـــی ئەوروپا (ماســـۆنیەکان) پلانێکی زۆر ووردیـــان دارشـــت بۆ شـــاردنەوەی خۆیـــان لەنـــاو مەســـیحی یەکاندا بەم شـــێوەیە: حاخام[٣٢] شـــیمور لەناوچەی ئـــارس نامە دەنێرێت بـــۆ حاخامی گەورەی

٣٢ پیاوی ئایینی جوولەکەکانە.

منتدى إقرأ الثقافي

جوولەکــە لە ئەســتانە (ئەســتەنبوڵ) داوای ئامۆژگاری لێــدەکات و دەڵێت ئێمە لــە ئەوروپــا چــی بکەین؟ ئەویــش لە وەڵامــدا بــۆی دەنووســێت و دەڵێت: داواتــان لێدەکــەم هەرچی نــەوەی جوولەکە هەیە لــە (مامۆســتا و پارێزەر و پزیشــك و پیاوە ئایینییەکانمــان) تێکڕا بچنە نــاو ئایینی مەســیحییەوە و خۆتان لەنــاو ئەواندا حەشــاربدەن تــا ئــەو بارودۆخــە تێدەپەڕێــت و دەگوزەرێت، ئەمــە یەکێکــە لــە بەڵگەنامــە بەناوبانگەکانــی ماســۆنییەکان مێژووەکــەی دەگەڕێتــەوە ١٤٨٩ز .

لەســاڵی ١٥٩٨ز لقــی ســکۆتلەندای ماســۆنییەکان پەیڕەوێکیــان دانــا بەمەبەســتی ڕێــك و پێــك کردنــی کارەکانیــان، لەســاڵی ١٧١٧ز بــارەگای ســەرەکییان گواســتەوە شــاری لەندەن، لەســاڵی ١٧٢٣ز (جەیمس ئەندرسۆن) دەســتوورێکی نووســیەوە بــۆ ماســۆنییەکان....دواجار و لەســاڵی ١٧٣٤ز دوای یانــزە ســاڵ (بنیامیــن فرانکلین) کــە یەکێکە لــە دامەزرێنەرەکانــی وویلایەتە یەکگرتووەکانــی ئەمریکا و دوای هەڵبژاردنی بە ســەرۆکی لقی ماســۆنیەکان لە وویلایەتی پەنســیلڤانیا دەســتوورەکەی نوێکــردەوە و ڕەوتی نوێی ماســۆنیەتی ڕاگەیاند....؟!

لەســاڵی ١٨١٥ز لــە وولاتــی بەریتانیا، لەســاڵی ١٨٧٧ز لە وولاتی فەرەنســا بڕیــاردرا کە جگە لــە جوولەکەش دەتوانێــت بێتە ناو ریزەکانی ماســۆنییەکانەوە و هەروەهــا ئەنــدام ئازادە هەر ئاییــن و بیــر و بۆچوونێکی هەبێت.

لــە کۆتاییدا گۆڕانکارییــە گەورەکە لەســاڵی ١٧٧٠ز و لەسەردەســتی (ئادەم وایــز هاوبت) ڕووی دا کــە بریتی بوو لــە یەکگرتنی نورانیەکان و ماســۆنیەکان، وە دروســت کردنــی دوو شــوێنگەی بەهێــز یەکێکیان لــە وولاتــی ئەمریکا و ئــەوی تریان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســت بە مەبەســتی دەســت بەســەردا گرتنی بــازاڕ و ئابــووری و دراو دواجــار سیاســەتمەدارەکاندا و دروســتکردنی فەرمان ڕەوایەتییەکــی جیهانی؟؟.

بــەم شــێوەیە توانیان لەجــاران بەهێزتــر بگەڕێنــەوە وولاتانــی ئەوروپا و


منتدى إقرأ الثقافي

پێگەی ئابـــووری و بازرگانـــی و کۆمەڵایەتییەکانـــی خۆیان بەدەســـت بهێننەوە، وویســـتیان لەچـــی بێت ئەنجامـــی بدەن.

ســـەرەکیترین و دیارتریـــن کاری جوولەکـــەکان بریتی بووە لە دروســـتکردنی دووبەرەکی لەنێوان هـــەردوو مەزهەبی (کاثۆلیك و پرۆتســـتانت)ەوە و کار بگاتە ئەوەی بیاندەن بە شـــەڕدا، هاوکات بەوەشـــەوە نەوەســـتان بەڵکـــو مەزهەبێکی نوێیـــان بەنـــاوی (ئینجیلیُ ئســـولّی) داهێنا کـــە زۆر تونـــدڕەون و باوەڕیان وایە دەبێـــت دەوڵەتـــی جوولەکە دروســـت ببێت لە فەڵەســـتین پاشـــان (مەســـیح) ســـەلامی خودای لەســـەربێت دێتە خـــوارەوە.

هەروەها لـــە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســـتیش توانیـــان چەندین ڕێکخـــراوی نهێنی دروســـت بکـــەن و لەناو دەوڵەتـــی خەلافەتی عوســـمانی ئەوکاتـــدا و خۆیان بە موســـوڵمان نیشـــان بدەن و لەناوەوە ئیمپراتۆریەتی عوســـمانی بڕوخێنن.



## پیلانی نورانیەکان و ماسۆنیەکان بۆ دەست بەسەرداگرتنی جیهان

سەرەتای دروست بوونی ئیمپراتۆریەتی بنەماڵەی ڕۆتشیلد بۆ دەست بەسەرداگرتنی پارە و سامانی هەموو جیهان، دەگەڕێتەوە بۆ (مائیر باور) کەکەسێکی بەرەچەڵەك جوولەکەی ئەڵمانی بووە، ناوبراو دامەزرێنەری ڕێکخراوێکی نهێنی جوولەکەکان بوو کە باڵێکی بەهێزێ ماسۆنییەکان بوو لە وولاتی ئەڵمانیا .

لەساڵی ١٧٧٣ز (مائیر ڕۆتشیلد)ی تەمەن ٣٣ ساڵ لەشاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیا لەگەڵ ١٢ گەورە سەرمایەدار کۆبووەوە و پێشنیاری ئەوەی بۆ کردن کە دەستەیەك دروست بکەن و هاوکاری دارایی پێشکەش بە بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان بکەن لەسەرتاسەری جیهاندا، دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکان لەو وولاتانەدا کە تیایاندا هەڵدەگیرساند، ئەم دەستەیە پەیوەندی بە شۆڕشگێڕەکانەوە دەکەن و هەوڵ دەدەن بۆ دەست بەسەرداگرتنی سامان و ژێرخانی ئەو وولاتانە!! ئامادەبووان بەم پێشنیارەی مائیر ڕازی بوون کە دەبێتە مایەی دروست بوونی دڵەراوکێی ئابووری و بڵاوبوونەوەی بێکاری و هتد.....

یەکەم وولات کە ئاگری شۆڕشیان تیادا هەڵگیرساند وولاتی فەرەنسا بوو لەساڵی ١٧٨٩ز، جوولەکەکان لەم کارەیاندا سەرکەوتوو بوون و کۆتاییان بە فەرمانڕەوایەتی پاشایەتی هێنا.

ڕۆتشیلد بیردۆزەکەی لەسەر بناغەی ئەم خاڵانە دارشتبوو:

١. هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕ و ترس و تۆقاندن لە چارەسەرکردنی جیاوازی نێوان نەتەوە جیاوازەکان لە وولاتەکاندا، هۆکاری ئەمەی بۆ ئەوە دەگەڕاندەوە کە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان بەهێز بەڕێوەدەبران پاشان وتی: (ڕاستی بریتییە لە هێز).

٢. زاڵ بوون بەسەر ژیری جەماوەردا لەڕێگەی بانگەشەکردن بۆ ئازادی ڕامیاری، ئازادی تاك، وە هەڵگیرساندنی جەنگی چینایەتی لەنێو کۆمەڵگەدا، گۆڕینی ئایین بە ئازادی؟؟.

